ئـەوشتـانـەی دۆزرانـەوە بـەدەست هێنـانی (دوو) شارستانێتی تازەبو ، یەکێکیان دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠٠٠) ساڵ پ . ز ، لەکۆمەڵێك گۆزەو گلێنە پیشان ئەدرێن ، کە بە چەند شێوەیەکی جیاواز دروستکراو نووێنەی جوانیان لەسەر کراوە ، بەچەند بۆیەیەك کە ناچێتەوە . ئەمـەش ئەوە دەگەیەنی ئەو زەمـانەی کـە تیا دروست کـراوە ، زەمانێکی ئاوەدانی‌و دەوڵەمەندی بـوەو دانیشتوەکـانی خاوەن هەستێکی بەرزبون . شارستانێتی تازەی دووەم ، دەگـەڕێتەوە بـۆ نـاوەراستی (دووهـەزار) سـاڵ پ . ز

ئێستا شاملۆی پێ‌دەوترێ بە ناوی گردی شـاملۆوە ، کەدەکەوێتە خوار پردە کۆنەکەی زەڵم ، لەدوری چـەند کیلومەترێك ، کۆمەڵێك پاشماوەی دێرینی تیا دۆزرایەوە ، هەتاکو ئێستاکە نە لە عێراق‌و نەلە دەرەوەی عیـراق، لە وڵاتە دراوسێکان وێنەی نیە ، مێژووی زەمانەکەشی نزیکە لە چاخی خوری (دووهەزار ساڵ پ.ز)[٧] .

٢ ـ لە سـاڵی (١٩٧٣) ، بـەڕێـوەبـەرێتی ئـاسـاری گشتی لەبەغدا ، هەڵسا بە ناردنی دەزگایەك بـۆ گردی یـاسین تەپە ، بە ئامانجی کنەو پشکنین تیایا لەبەر ئەم هۆیانە :

أ ـ گەران بەدوای شـاری (ئاسـور) کە (دور ـ ئـاشور) ی پێ‌وتراوەو پاشای ئاشوری (ئاشور ناسـرپاڵ) (٨٨٣ ـ ٨٥٩ پ . ز) لەسەر کەلاوەکانی شاری لولو ، ناسراو بە (ئەتلیلا) دروستی کرد[٨] .

ب ـ بۆ زانینی مێژووی ناوچەکە لەسەر دەمی ئەکەدیەکان‌و دوای ئەوان ، بۆ ئەوەی ببێتە یارمەتی دەرێك ، تیشك بخەینە سەر گوتی‌یەکان ، کە فەرمان رەوای عێراقی‌یان بۆماوەی زیاتر لەسەدەیەك کرد .

جـ ـ یاسین تەپە لەبەر ئەوەی ٢٥ مەتر بەرزە ، ئەم بەرزی‌یە وامان لێدەکات بڵێین : چینەکانی ناوەوەی ، هەمو ئەو چاخە مێـژووییانـەی لە خۆ گـرتوە ، کـە بـەسـەر نـاوچـەکـەدا ، تێپەریوە[٩] . ئەوەی من لێرەدا ئەمەوی قسەی لەسەر بکەم ، خاڵی یەکەمەو قسەکردنـە لەسەر شـاری (دور ـ ئاشـور) ی ئاشوری . لەوانەیە (دور ـ ئاشور) ، هەمان ئەو شارە بێت ، کـە ئێستا لای ئێمـە بەشـارەزور ، ناسـراوە ، بە هـۆی ئەو گۆڕانەی بەسەر ناوەکەدا هاتوە ، لە کۆنەوە بۆ تازە . خۆ ئەگەر ئەمە راست بێت ، ئەتوانین ئەو گۆرانە بـەم شێوەیـە پیشان بدەین : (دور ـ ئاشور) بوە بە (ئاشور ـ دور) ، (شار ـ دور) بۆ (شار ـ ذور) یان (شار ـ زور) . ئەم گۆرانەش کە بە سەر ئەم جۆرە ناوانەدا دێن ، شتێکی سروشتی‌یە ، ئەتوانـین لە زۆربەی ناوە مێژووییەکاندا رەچاویان بکەین ، نمونەش بۆ ئەمە (بێتواتە) و (مەسۆ) و گەلێکی دیکەیە . گێرانەوەشیان بۆ سەر ئـەسڵەکانیـان ، هەروا شتێکی ئـاسان نیـە ، ئەو کـەسەی ساخیان دەکاتەوە ، پێویستە شارەزاییەکی تەواوی لە مێژووی کۆن‌و ئاسارو زانیاری‌یەکانی دیکە هەبێت . ئەوەی قسەم لێوە کرد ، رایەکە ئەتوانین بیخەینە پاڵ رایەکانی دیکە ، قسـەی تەواویش لەمەدا ، تەنیا کنەو پشکنینی دامەزراوی ئـاساری گشتی لە دوا رۆژدا ، دەری ئەخات . هیـوادارم بەم چـەند تێبینی‌یە ، توانیبێتم خزمەتێکم بە مێژووی ئەم گەلە رەسەنەم کردبێت‌و دڵی مامۆستا (حسـام الدین) یشم‌زویر نـەکردبێت‌و بەسنگێکی فراوانەوە لێمیان وەربگرێت .

## پەراوێزەکان

١ ـ کلوديوس جيمس ريچ ـ رحلة ريج في العراق علم ١٨٢٠ ـ الجزء الاول ـ نقلها الى العربية بهاء الدين نوري ـ ١٩٥١ ـ ل ١٩١ .

٢ ـ کلوديوس جيمس ريچ ـ هەمان سەرچاوەی پێشو ـ ل ٧٩ .

٣ ـ ياقوت الحمـوي ـ معجم البلدان ـ المجلد الثالث ـ دار احيـاء التراث العربي بيروت ـ لبنان ـ ل ٣٧٥ ـ ٣٧٦ .

٤ ـ سـومر ـ الجـزء الأول والثاني ـ المجلد السـادس والعشـرون ١٩٧٠ ـ ل ٣٥٢ .

٥ ـ د. فاضل عبدالواحد علي ـ محاضرات على طلاب كلية الاداب ـ قسم الاثار ـ تاريخ الشرق ـ السنة الثالثة ١٩٦٧ ـ ١٩٦٨ .

٦ ـ کەمال نوری ، گۆڤاری بەیان ، ژمارە ٤٨ ئازارو نیسانی ١٩٧٨ ل ٥٢

٧ ـ سومر ١٩٦٠ ـ المجلد السادس عشر ـ الجزء الاول والثاني ـ ل ١٣٦ .

٨ ـ طه باقر ـ مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ـ جـ ١ ـ ل ٤٩٩ .

٩ ـ اسماعيل حجارة ـ سومر ـ الـ الاول والثاني ـ المجلد التاسع والعشرون ١٩٧٣ ـ ل ص/ج .

بەیاد عەبدولقادر

# پێداچوونەوەیەکی خێرا

# بە چەند لایەنێکی دەنگسازی زمانی کوردیدا

(بەشی یەکەم)

● لەم نووسینەدا کورتەی ئەم باسانەت بەرچاو دەکەون
* کێشەکانی دەنگسازی زمانی کوردی
* واتای ڕەسەنێتی دەنگ
* پێشکەوتنی دەنگەکانی زمانو تیۆری ڕۆسلۆ
* ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی پێشکەوتنی دەنگ
* کاریگەری زمانی بێگانەو ڕەنگدانەوەی بۆ سەر زمانی کوردی
* واتای فەرهەنگێتی دەنگ
* لایەنێکی دیکەی جیاوازی دەنگو پیت
* کۆمەڵە سەرنجێك دەربارەی دەنگەکانی (ح ، ع ، غ ، ق ،س ،ص ،نگ ) .

● یەکەم کێشە کە تووشی دەنگسازی زمانی کوردی دەبێت دیاری کردنی ـ دەنگە کوردیەکانە ـ کە بەدەنگە ڕەسەنەکان لەگەڵ جێگەدا نێودەبرێن ، ئەمەش پەیوەندی بە سروشتی دەستگای ئاخاوتنی نەتەوەکە خۆیەوە هەیەو هەر نەتەوەیەك بە درێژایی مێژوو ڕاهاتوی کۆمەڵێك یاساو ڕژێمی دەربڕینی دەنگی یە لەبواری ژیاندا پێیان ڕاهاتووەو بە ئاسانی دەریان دەبڕێت ، بۆنمونە عەرەبێك زۆر بەگرانی دەتوانێت دەنگی [پ] یان [ژ] دەربڕێت بە هەمان شێوەش کوردێك توشی گیروگرفت دێت لەکاتی دەربڕینی دەنگی [ث] لە هەر ووشەیەکدا (دیارە مەبەست لەشێوەی کرمانجی خوارووە یان لکەشێوەی سۆرانی چونکە دەنگی [ث] لە هەورامیدا بەکار دەهێنرێت) . دەتوانین ئەم ڕاستیەو واتای بوونی دەنگیڕەسەن لەو ووشانەدا بەدی بکەین کە لەزمانێکەوە دەچن بۆ زمانێکی دی ، هەست دەکەین بەر کاری گۆڕینو داپلۆسین دەکەون لە ئەنجامی ڕانەهاتنی دەستگای ئاخاوتنی ئەو نەتەوەیە بەو جۆرە دەنگە ، بۆ نمونە ووشەی (عبدالرحمن)ی عەرەبی کە هاتۆتە نێو زمانی کوردیەوە بۆتە (ئەوڕەحمان) ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەنگی [ع] لەسەر زاری ئاخێوەری کورد گران بووە و هەوڵی تێکشکاندن

وگۆڕانی داوە بە دەنگی [ئـە] بە هـەمان شێـوەش مرۆڤێکی فـەرەنسی یـان ئینگلیـزی نـاتـوانێت دەنگی [ع] لەووشـەدا بئاخێوێت لەبـەرئەوە بـە دەنگێکی بزوێنی وەکـو [ئە] دەری دەبڕێت . لێکدانەوەی ئەم گۆڕانکاریە بەلای ئەوەدا ناچێت کە ئاخێوەری کـورد یان فـەرەنسی بەویستو خـواستی خۆیـان نەیانەوێت ئەو دەنگە دەرببڕن بـەڵکو دەستگـای ئاخـاوتنیان توانای خەملاندنی ئەو جۆرە دەربڕینەی نیە لەبەر ئەوە ناچار دەبن جۆرە دەنگێکی دیکە بەکار بهێنین کە تارادەیەك (سازگە) یـان شوێنی دروست بـوونیان لەیـەکەوە نـزیك بێت بـڕوانە دوودەنگی [ئا ، عا] یان ووشەی (خنق)ی عەرەبی بۆتە (خنك) لە ووشـەی (خنکانـدن)دا و بەمـەرجێکی بێ چەنـدو چـۆن دانانرێت کەهەمـوو هاتنی دەنگێکی بێگـانە لەزمـانێکەوە بـۆ زمانێکیدی ببێتە هۆی ئاڵوگۆڕی دەنگی ـ بەتایبەت ئەگەر ئەو دەنگە خوازراوە تەمەنێکی درێژی مێژووی بەردەوامی هەبێت بۆخۆسەپاندنی ، ئەوکاتە دەشێت زۆر کاریدیکەی وەك شوێن گۆڕکێی بەسەردا بێت بۆنمونە (وضع) دەبێتە (وەزع) ، کـە هەموو ئەمانەش پەیوەندی بە بەکار هێنانو ڕاهاتن و ڕادەی ڕۆشنبیری ئاخێوەرەوە هەیە بۆئەوەی ئەو ووشەیە وەك خۆی بەڕاستی بئاخێوێت ، خۆکە دەنگێکیش سوچێکی ووشەیەکەوە خـۆی دەکات بـە کونجێکی زمـانێکی دیکـەدا هـەروا وەکـو بەرزەکی بانان بۆی دەرناچێت دەبێت باجوسەرانەی تەواو بەو زمانە بداتو ملشۆڕی هەموو یاساو ڕژێمە دەنگیەکانی ئـەو زمانە بکات چونکە هەموو زمانێك وەك چۆن کـۆمەڵە دەنگێکی تایبەت بە خۆی هـەیە بـەو جۆرە خـاوەنی نیزامێکی دەنگی تایبەتیە لە چۆنیەتی ئاوازو گونجاندنو بەدوای یەکدیداهاتنی دەنگـەکان (ڕێـك خستنی ئاوازی ووشـەو ڕستـە) کـەواتـە دیسـانەوە کـاتێك جـۆرە سیستەمێکی دەنگی لەزمـانێکـەوە دەگوێزرێتەوە بۆزمانێکی دی ئاخێوەر تووشی گیروگرفت دەکات کە ئەمـە بە سـەرنجدانی وورد دەردەکـەوێتو زۆر جاریش وادەبێت کـە ئـاڵوگـۆڕی دەنگی یـان پـاشو پێش خستنی دەنگیو ... هتد ڕوودەدات ، ئەگەرچی هەموو ئەو دەنگانەش لە زمانی ئاخێوەردا هەبن . بۆ نمونە (بكل وجە)ی عەرەبی بـۆتە بەهیچ (کلۆج) یك[1] و هەست بەوە دەکرێت کە ئاخێوەری کورد هەوڵی داتاشـینو چەکـوش کاریو زیـاد کردنو پـاشو پێش خستنی تێدا داوە بە پێی ویستو خواستی خۆی .

● دووەم کێشە کەبەرەو ڕووی دەنگزانـانی کورد دەبێتـەوە دیاری کردنی بنەچە (اصل)ی زمانە یان بەشێوەیـەکی دیکە دەتوانین بڵێن دیاریکردنی بنەچەی ووشـە بۆ وەئـاگابـوونی چۆنیەتی پێشکەوتن یان گۆڕانی دەنگی ووشە بەپێی چەرخ کە ئەمە گرنگییەکی بنچی هەیە لە مەیدانی دەنگسـازی زمانی کوردیداو خۆی لە بەشێکی گرنگو سەربەخۆیدا دەبینێتەوە ، ئەویش پێش ، کەوتنی دەنگەکانی زمانە بەجیاوازی ئاخاوتنی نێوان نەوەیەكو ، نەوەیەکیدی دەوتربێت کە سەردەمێك لێکیان جوێ بکاتەوە ، ئەم پێش کەوتنەش لەسەر خۆو بەڕێكو پێکی ئەنجام دەدرێت کە لەبنەڕەتدا ملشـۆڕی چەنـد یاسـایەکی گیرن . بەلام مەرج نیە هەر وەکو ماکس مۆلەر و وتنی، (Whitney (Max Muller) بـۆی چوون پێشکـەوتنی دەنگی بەرەو ئـاسان بوونی ئاخاوتن بچێت (کە ئەمە هەڵەیەکەو لە زۆر جێگەدا کراوە بۆیە بەپێویستی دەزانم تـۆزێك درێـژەی پێ بدەم) بێگـومان مرۆڤ دەسەلاتی لەو ئاڵوگۆڕ و تێکدانە دەنگیانەدا نیە بەڵکو ئامادە بوونی ئەندامەکانی ئاخاوتنو بزووتنەوەیان لەنەوەیەکی دیدا هۆی سـەرەکی گۆڕانی دەنگی ووشـەکەیـە بۆ بـارێکی جیاواز لەدەربڕینی کۆنی ووشە کە بۆنمونە دەنگی [ث] لەزۆر ناوچەی نیشتمانی عەرەبیدا بووە [ت] یان [ذ] بووە بە [د] یان [ظ] بووە بە [ض] بە هەمان شێوەش دەنگی [ئا ـ a]ی کۆتایی زۆر ووشەی لاتینی بە تایبەت لای فەرەنسیەکان گۆڕاوە بـە (ئە ـ e) دەشێت ئەم دیاردەیە ئەمرۆ بەو جۆرەش نەمابێتەوە بەڵکو ئەمەی ئێمە باسی لێـوە دەکەین دەگـەڕێتەوە بـۆ نێوان سەدەی هەشتەم سەرەتای سەدەی چـواردەیەم و بـۆ پێش کـەوتنی دەنگەکـانی زمان تیـۆرییەك هـەیە کـە بە تیـۆری Rousselot نێو دەبرێت ئەم تیۆرەش دەڵێت :

ئەگەر بەراوردی ئەندامەکان ئاخاوتنی مرۆڤ لەچـاخە بەردینەکاندا لەتەك مرۆڤی چاخی نوێـدا بکرێت هـەست بەو گۆڕان و پێشکەوتنە دەکرێت کە بەردەوام ئەندامەکانی ئاخاوتن

تیدا ژیاون ، هەر ئەم پێشکەوتنەش کاری کردۆتە سەر گۆرانی دەنگی ووشەکان بەشێوەیەکی وا کەبگونجێت لەتەك ئەو بارەی ئەندامە کە لە پێشکەوتنیا کۆتایی پێ هاتووە . بێ گومان دانانی بنەمایەك بۆپێشکەوتنی رێرەوی دەنگ بەئاسان نازانرێت چونکە ئەم جیاوازییە دەگۆرێت بە جیاوازی زمانەکان و شوێن و نەتەوەکان ، بەلام بەلای زمانی کوردی و دەنگزانانی کوردەوە ئەم مەسەلەیە یەکجار ئالۆزەو ئەرك و ماندووبونێکی مەحالی گەرەکە ، کەبۆ دۆزینەوەی بنچینەی هەر ووشەیەك بگەرێینەوە سەرنەو سەرچاوەیەی ووشەکەی لێوە هەڵ قوڵاوە بەجۆرێکی دی دەبێت بگەرێینەوە سەر ئاوێستا[٢] (بۆیە بەچاری بۆروون کردنەوە دەبێت بگەرێینەوە سەر چاووك مصدر) کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا جێگەی مشت و مڕی دیکەیە) پاشان لەویوە هەنگاو بەهەنگاو گۆرانی دەنگی ووشەو بەرەو پێش چوونی دیاری بکەین ، دوورکەوتنەوەو پێشکەوتنی دەنگی ووشە لە بنچینەکەی گەلێك هۆکاری جیاواز لەزمانرەوایی تێدا دەکەن وا لێرەدا خاڵژمێریان دەکەین :

١) پێشکەوتنی تەواوی سروشتی ئەندامەکانی ئاخاوتن لەبنچینەو ئامادەبوونیاندا .

٢) هەڵەکانی بیستن .

٣) جیاوازی ئەندامەکانی ئاخاوتن لەسازکردنی دەنگەکاندا بەپێی جیاوازی نەتەوەکان .

(٤) هاوکێشی دەنگەکانی ووشە لەتەك یەکتریدا

(٥) شوێنی دەنگ لەووشەدا

(٦) نەوەی دەنگەکان و شیبوونەوەی هەندێکیان لەتەك هەندێکی دیکەیان

(٧) کاریگەری بارەکانی رامیاری و کۆمەلایەتی و جوگرافیو دەروونی و ... هتد .

(٨) کاریگەری باری ئەدەبی .

● سێیەم کێشە کە تارادەیەك هەر پەیوەندی بە دووەمەوە هەیە دابەش بوونی زمانی کوردیە بە چەند شێوەیەکەوەو هەر شێوەیە ئەمڕۆ تارادەیەك سەر بەخۆیی خۆی پچڕیوەو بواری تایبەتی خۆی لەرێرەوی پێشکەوتنی دەنگیدا بۆ خۆی پچڕیوە کە هەرگیز ناشێت پێشکەوتنی دەنگی لەم هەموو شێوانەدا لەیەك جۆردا خۆی ببینێتەوە ، هەر ئەو جیاوازی پێشکەوتنی دەنگیەشە کە زمان دەکات بەچەندە بەشە شێوەیەکەوە لەبەر ئەوە هەرگیز بەراست نازانرێت ئەو یاسا دەنگیانەی کە بۆ نمونە بۆ کرمانجی خواروو دادەنرێت بەسەر هەموو شێوەکانی دیکەدا بچەسپێ ، خۆ ناشکرێت بۆ هەر بەشە شێوەیەك لێتوێژینەوەی جیاوازی دەنگسازی سەر بەخۆ بکرێت بەتایبەت لەکاتێدا هەموو ئەو هەوڵەی کە تائێستە لە ئارادایەو ئێمە لێرەدا باسیان لێوە دەکەین تەنها سۆرانی تەنیا لکە شێوەی هەولێرو مەلبەندەکەیەتی ، ئەگەرچی نێوی دەنگسازی زمانی کوردیشیان لێ نرابێت[٢] .. بەکورتی دەنگسازی زمانی کوردی بەو گێرە شێوێنییە دەمێنێتەوە تا وە کو زمان و ئەدەبی یەکگرتووی کورد بریاری دوایی پێهێنراوی لەسەر دەدرێت لەو روانگەیەشەوە ئەو سادەنگسازی زمانی کوردی بەئەنجام دەگەیەنرێت .

● پێشان ووتمان دەنگەکانی زمانی کوردی واتە ئەودەنگانەی کە کورد خۆی بەخاوەنیان دەزانێت (بێ گوێدانە ئەوەی ئایا ئەم دەنگانە چەند نەتەوەیەکی دی خۆی بەخاوەنیان دەزانێت یان نا ، چونکە دەنگەکانی زمان سنورێکی تایبەتیان هەیەو تارادەیەکی زۆر شێوازیان لای نەتەوەکان چوون یەکن) ئینجا مەرج نیە ژمارەو چۆنیەتی ئەم دەنگانە بەجۆرێکی نەگۆر بەدرێژایی مێژوو بمێننەوە ، ژمارەی دەنگەکانی زمان لەژێرکاری زۆر هۆکاردا دەشێت زیادو کەم بکەن بۆ نمونە یەکێك لەو هۆکارانە (کە بەئاشکرا بەزمانی کوردیەوە دیارە) لەئاکامی

کاریگەری تێکەڵاو بوون و هاوسێیەتی نەتەوەیەك بە نەتەوەیکی دیکەوە ، ئەم کاریگەریەش کتوپڕ دیاری نادات بەڵکو لەماوەیەکی مێژوویی درێژخایاندا ڕوودەدات تاوەکو ئەو دەنگە لەو زمانەدا جێی خۆی دەکاتەوە ، چونکە زمان وەك درەختێك وایە کە سەوز دەبێت و لك و پۆپ دەردەکات و پەل دەهاوێت و ڕەگ دادەکوتێت و شیاوی موتربە کردنیشە ، جگە لەمەش ئەو کاریگەریە لەزۆر لایەنی ڕامیاری یان زانستیدا - مەبەست زاراوەی زانستییە - دەبینرێتەوە لەمیانەی داسەپاندن و زاڵبوونی زمانێك بەسەر زمانێکی دیکەدا چونکە وەك چۆن کاریگەری باری ڕامیاری

لەبواری کۆمەلایەتی و ئابوری و ڕۆشنبیریدا بە شێوەیەکی گشتی خۆی دەنوێنیت بە شێوەیەکی تایبەتیش کاریگەری لەزماندا دەبێتە هۆی دەسەلات کێشان بە سەر زمانی ژێر دەستەو هەولی دیاری کردنی سنوورو پێشکەوتنی موفرەدات و گەشەسەندنی زمان دەدات و دەبێتە هۆی تێ‌هاویشتنی و جێ‌کردنەوەی چەند دەنگێك لەمیانەی چەند ووشەیەکەوە ، شوێن پێی ئەم دیاردەیە بە تەواوی بەزمانی کوردیمانەوە دیارەو بەهۆی ئەم کاریگەرییەوە چەند دەنگێکی وەکو [ح، ع، ق، غ]ی خستۆتە پاڵ دەنگە ڕەسەنەکانی زمانەکەمانەوە (کە دەتوانرێت بەتێڕوانین و سەرنجدانی وورد بنەچەی هەندێك لەو ووشە خوازراوانە نباسرێتەوە) هەر ئەم ڕاستیە خۆی لەخۆیدا کونجێکی دیاری کردووە لەکێشەی بەرپاکردنی زۆر بیرو ڕای جیاواز دەربارەی ژمارەی دەنگەکانی زمانی کوردی بەوەی هەندێك لەشارەزایانی زمانی کوردی ئەم دەنگانەیان بە کوردی لە قەلەم داوە بێ ئاوڕدانەوەو سەرنجدانی ووردو قوڵی ئاوێستاو بێ‌لێکدانەوەی مەبەست و واتای ئەو ووشانەی کەئەم دەنگانەیان تێدایە ، بەلام ئەمڕۆ کاتی ئەوە هاتووە پاش ئەو لێکۆڵینەوە [illegible] ڕیی و زمانەوانیە بەراورد سازیە تێرو تەسەلانەی کە لەگەڵ ئاوێستادا کراون بڕوانامەو بەڵگەیەکی دوایی پێ هاتوی وایان پێشکەش کردوین کە ئەو بریارەبدەین کە (زمانی ئەمڕۆی کورد کوڕو لەدایك بووی ئاوێستایە) . ئاشکرا کردنی ئەم باری سەرنجەو پەنجە ڕاکێشان بۆی بەو جۆرە ئەومانایە نا بەخشێت کە لەبەر ئەوەی ئەم دەنگانە (ح ، ع ، غ ؛ ق) لەبنەچەدا هی کوردنین ئیتر لەدەنگسازی زمانی کوردیدا بیانسرینەوەو هەولی سەرکوتاندنەوەو جێ پێ لێژکردن و نەهێشتنیان بدرێت لەکاتێدا بە سەدەها ووشە هەبن کە ئاخێوەر ئەودەنگانەیان تێدا وەك پێویستیەکی ژیانی ڕۆژانە بەکار بهێنێت و هەموو دەنگزانانی کورد لەتوانایاندانیە تەنها دەنگێك چیە لەسەر زاری ئاخێوەری ئاسایی بسرنەوە بەتایبەت ئەگەر ئەو دەنگە (یان بافراوانتر بڵێن ئەو ووشانە لەماوەیەکی مێژوویی درێژخایاندا جێی خۆیان کردبێتەوە) .

ئێمە لەدەنگسازیدا تەنها ئەوەندەمان لەسەرە کەبێ ترس و سلەمینەوە بڵێن ئەم دەنگانە هی کورد نین پاش ئەوەی ئەو هۆیانە دەستنیشان دەکەین کەوامان لێ دەکەن ئەو بریارە بدەین کە لەڕاستیدا تارادەیەك جێگەی مەترسی و بەگژداچوونەو مشت و مڕی کەسانی دیکەش بن - ئەم مەسەلەیە پێش ئێمە باسی لێوەکراوەو کێشەکەشی لەنێو ڕووپەڕەی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا وە بەرچاوی هەموو خوێندەوارێکی کوردەوەیە - ئینجا دەمێنێتەوە سەر ئەوەی ئایا ئەم دەنگانەی کە ئێمە بەهی کوردی نازانین لەدەنگسازی زمانی‌کوردیدا وێنەی دەنگی تایبەتیان بۆ دەکێشرێت یان نا ؟ .. یەکێك لەگرنگیەکانی دەنگسازی هاوبەشی کردنیەتی لەپێکهێنانی فەرهەنگی زماندا ، مەبەستیش لە فەرهەنگێتی دەنگسازیش ئەوەیە : کە بەرانبەر هەر ووشەیەك جۆری گۆکردن و ئاخاوتنی (دەربڕینی دەنگی ئەو ووشەیە) ڕوون بکرێتەوە ، ئەمەش دیارە تەنها ئەو کەسانە سوودی لێ وەردەگرن کە دەیانەوێت فێری زمانێکی دیکەببن .. بۆنموونە کوردێك کەبیەوێت فێری زمانی ئینگلیزی بێت جگەلەوەی کە پێویستی بەفێربوون و زانینی واتای ووشە هەیە بەو جۆرەش پێویستی بەفێر بوون و زانینی چۆنیەتی دەربڕینی ئەو ووشەیە هەیە بەو جۆرەی کە ئینگلیز دەیئاخێوێت و گرنگی دەنگسازی لەمەی دواییاندا بەدی دەکرێت ، لەبەرئەوە لە دەنگسازیدا بەرامبەر هەر دەنگێك لەدەنگەکانی زمان وێنەیەکی دەنگی بریار لەسەر دراوی جیهانی هەیە ، ئەم وێنە دەنگیانە لە

لاتینی) یەوە وەرگیراون و دەتوانین بلێن هەروەك پیتەکانی زمانی ئینگلیزی ئیستەوان لەگەڵ کەمێك دەستکاریدا . دەبێت ئاگاداری ئەوەش بکەین کەواتای وێنەی دەنگ لەفەرهەنگی دەنگسازیدا لەواتای پیت لەفەرهەنگی زماندا جوێیە ، کە بیسانەوە ئەمەش هەر باسکردنە لەکێشەیەکی دیکەو گەلێك لەزمانناسەکانمان بەهۆی کەمی شارەزاییانەوە لەدەنگسازی زمانی کوردیدا لە جوێ کردنەوەی واتای دەنگ لەواتای پیتدا کەوتونەتە هەڵەوە . دەنگزانانی کورد هەریەکە لەلای خۆیەوە چمکێکی ئەم جیاوازیەیان گرتووەو هەوڵی ڕاستکردنەوەو ڕوونکردنەوەو جوێکردنەوەی واتاکانیان داوە ، ئەوەش کە لێرەداماوەو باسی لێوە نەکراوەو گرنگیەکی سەرەکی لەم کێشەیەدا هەبێت تەنها ئەوەندەیە کە بلێن وێنەی دەنگ تەنها لەستوونی فەرهەنگی دەنگسازیدا بەکار دەهێنرێتو ئەم لەتەك پیتدا بەهاوشان نازانرێت لەژمارەدا بۆنمونە ووشەی (چەقۆ) لەڕێنوسی ئینگلیزیدا دەنوسرێت (Knife) کەچی لەگۆکردنو ئاخاوتندا (واتە لەفەرهەنگی دەنگسازیدا) بە (naif) دەبێژرێت . نمونەی دیکە لەم بارەیەوە زۆرەو هەرچی وێنەی دەنگیە لە بچوکترین یەکەی ئاخاوتندا بە(فۆنێم) پێناسە دەکرێت بەلام پیت بچوکترین یەکەی ڕێنوسە لە نووسینەوەی زماندا هەموو تاکەکانی ئەو نەتەوەیە لە ژیانی ڕۆژانەو ئەدەبیات وزانست (نووسینەوەی ئاسایی) پەیڕەوی دەکەن ، بەلام هەرچی دەنگە تەنها ئەرکی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی گۆکردنو ئاخاوتنی ووشە دەبینێت هەروەکو پێشان باسمان لێوە کرد .

بۆ جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە سەرباسەکەی خۆمانو دووبارە دەڵێینەوە دەستنیشانکردنو دیاری کردنی دەنگە ڕەسەنەکان وجوێ کردنەوەیان لە دەنگە نارەسەنەکانو وێنەکێشانی دەنگی بەپێی ئەو وێنە دەنگیە جیهانیانەی کە بڕیاریان لەسەر دراوە بەئەرکی دەنگسازی دەزانرێت ، بۆیە دەنگەکانی [ح ، ع ، غ ، ق ] کە لەئاویستادا نینو بەدەنگی کوردی ڕەسەن ناژمێرێن لەبەر ئەوەی لەزمانی کوردی ئەمڕۆماندا بە شێوەیەکی فراوان بەکاردێن (بەتایبەت [غ،ق]) دەبێت هەموو ئەم دەنگانە وێنەیان بۆبکێشرێت وجێگەی تایبەتیان لەدەنگسازی زمانی کوردیدا بۆ تەرخان بکرێت .

● ئێستاش پاش ئەو کورتە باسەمان دەربارەی ڕەسەنێتیو نارەسەنێتی بۆمان هەیە یەکە یەکە بەدەنگەکان خۆیاندا شۆڕببینەوە وهەندێك باری سەرنجی دیکەشیان ئاراستەبکەین .

(د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف) لەلاپەڕە (٤٨) کتێبەکەیدا (زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا) ولەژێر ناوی (ڕەسەنی یان نارەسەنی هەندێ دەنگی زمانی کوردی) دەربارەی دەنگی [ح] لە پەراوێزی (٤٥)دا پەنجەی ڕاکێشاوە بۆکتێبی (زمانی کوردەکانی سۆڤێت)ی (چ ،خ ، باکاییف) کە دەڵێت :ـ (نەبوونی [ح] وەك فۆنێم لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی تورکمەنستانو ئازربایجانو خۆراساندا و نەگونجاندنی لەگەڵ زمانە ئێرانیەکان ئەوە دەردەخەن کە لە زمانی عەرەبیەوە وەرگیرابێت) پاشان دکتور بەڵگەیەکی دیکە دەهێنێتەوە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە کۆنسۆنانتی [ح] لە زمانی عەربیەوە وەرگیرابێتو دەڵێت : (لەبەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستاندا لە زۆر ووشەدا چ لە زمانی بێگانەوە وەرگیرابن یاخود بەڕەسەن کوردی بن دەنگی [ح] و [هـ] تێکەڵ دەکرێن هەندێکی دیکە [هـ] دەئاخیورێت ..

(حەبس← هەبس ، حەسرەت ← هەسرەت
حەساب ← هەساب ، حەنار← هەنار) ئەم دیاردەیە هەندێجار لەزمانی ئەدەبیشدا خۆی دەنوێنێ ... ئەگەر [ح] دەنگێکی ڕەسەنی کوردی یاخود ئێرانی بوایە ئەوە نەدەبووبەو جۆرە لەگەڵ [ە]دا تێکەڵ بکرێت .] هەرچی (د. جەمال نەبەز) یشە دەربارەی ئەم دەنگە دووڕای جیاوازی هەیەو دەڵێت : یان لە زمانی عەرەبیەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردیەوە یان لە گۆڕانی دەنگی [ئـا ،هـ] ەوە پەیدابووە . دیارە لەمەدا مەبەستی لەووشەی (زەبەلاە) بووە کە لە ئاکامی گرانی دەربڕینی دەنگی [هـ]ی کۆتایی ووشەکەدا بووە بە (زەبەلاح) بەڵگەی دیکە لەم بارەیەوە زۆرن کە ئەوە بسەلمێنن دەنگی [ح] دەنگێکی ڕەسەنی کورد نیە ، ئێمە لێرەدا بەوەندە کورتی دەکەینەوە و کۆتایی

پێ دەهێنین چونکە ئەو وشانەی کە لە زمانی کوردیدا هەن و دەنگی [ح]یان تێدایە (لەپلەی یەکەمدا) ژمارەیان لەپەنجەی دەست تێپەر ناکات و (لەپلەی دووەمیشدا) بەسەرنجدان لێیان بۆمان دەردەکەوێت کە لەزمانی عەرەبییەوە وەرگیراون بۆنمونە لەوشەکانی (حەز ، حەب ، حەج ، محەمەد .... هتد) یان گۆڕانی دەنگیان بەسەردا هاتووە وەك وشەی (حق) بووە بە [هەق] یان (بحث) بووە بە (باس) و لە (پلەی سێیەمیشدا) هەندێك لەو وشانە کە لەبنەڕەتدا کوردین لە گۆڕانی دەنگی [هـ] وە هاتون بۆنمونە وشەی (هەبت)ی ئاوێستا بووەبە (هەفت) پاشان بووە بە(حەوت) یان (هەفتە) بو ە بە (حەفتە) .. خۆ لەگەڵ ناوچەی کوردستانی عێراقدا وەك لە دەوروبەری رانیەو هەولێر دا ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرێت لەگەڵ دەنگی [ع]دا بۆنمونە (محەمەد) دەکەنە (معەمەد) یان (عەلی) دەکەن بە (حەلی) چونکە سازگەیان زۆر لێکەوە نزیکە (بڕوانە [ح ، ع]) کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی دیکەیەو دەیسەلمێنێت کە هەتائێستاش دەنگی [ح] لە سەر زاری ئاخێوەری کورد ئاسان نیەو بەتەواوی جێی خۆی نەکردوتەوە .

هەموو ئەوپلانەی بۆ دەنگی [خ] مان دیاری کرد بۆ دەنگی [ع] ش بەڕاست دەزانرێت تەنها ئەوەندە نەبێت کە دەنگی [ع] لە زۆربەی ئەو وشانەدا کەعەرەبین دەگۆڕێت بە دەنگێکی بزوێن (ڤاول)و دەنگی [ع]ەکە خۆشی لەناو دەچێت ، کەم جاریش وادەبێت دەنگی [ع]ەکە لەناوبچێت و تەنها دەنگە بزوێنەکەی دوایی بئاخیورێت ... بۆنمونە :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| معاملة | مامەڵە |
| طعم | تام |
| معنی | مانا |
| معتمد | متمانە |
| عبدالرحمن | ئەورەحمان |
| عزيز | ئازیز |
| دعوی | داوا |
| معرفة | ماریفەت |
| عشق | ئەشق |

ئەمەو بەدەگمەنیش واڕوو دەدات کە دەنگی [ئا - a] بگۆڕێت بۆ [ع] هە] وەك :

ئاسمان← عاسمان

قورئان← قورعان

ئاست← عاست

هەرچی دوو دەنگی [ق ،غ] ە ئەمڕۆ جێی خۆیان لە سەر زاری ئاخێوەری کورد کردوتەوە و خوێنەگەر ئەو بەڵگە مێژووییو بەراورد سازیانە کەلەگەڵ ئاوێستادا کراون بە دەستەوە نەبوایە نەمان دەتوانی بەنمونە بەڵگەی بێ چەندو چوونو داسەپاوی وا بەدەستەوە بدەین کەجێگەی دان پێدانانو بڕوا پێهێنانی بێمشتو مڕی هەموو لێتوێژەرەوانی زمانی کوردیمان بێت .لەگەڵێك زمانانی وەکو ئینگلیزیدا کەدەنگی [ق] یان تێدانیە دەنگی [ك] لە شوێنی بەکاردەهێنن بەڵام لەبەر کاریگەری و

نزیکی شوێنی جوگرافی کوردستان (ونەخوازن پارچە پارچەیی لەنێو نەتەوەکانی وەکو تورك وعەرەب کە هەر دوکیان ئەم دەنگەیان تێدایە وایان کردووە کە ئەم دەنگە کاریگەریەکی یەکجار زۆری هەبێت بۆ سەرزمانی کوردی بەجۆرێك دەتوانین بڵێین سنوری فراوان بوونی ئەم دەنگە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داگیرکردنی کوردستان لەلایەن تورکە عوسمانلیەکان ، خۆ گەلێك ناوچەو شوێنەواری کوردستان هەن هەوڵی بەتورك کردنی ناوەکانیان دراون و هەتا ئەمڕۆش ناوەکانیان بە تورکی ماونەتەوە ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە گەلێك وشەی تورکی هەن لەپاش تورکەکان لەنێو زمانەکەماندا بەجێماون بۆنمونە وەکو (قارەمان) وگەلێکی دیکەش وشەهەن کە ئەمڕۆ

ـ تيەكی تايبەتی سەربەخۆی دوور لەواتا توركيەكان بۆخۆيان
ـجريوە بۆنمونە (قەرەبالغ) كەلە زمانی توركيدا مانای (ئەسپی
ـمش) دەگەيەنێت ، ئەمەش ديارە لەبازاری كڕين و فرۆشتنی
ئەسپ و كۆبونەوەی خەڵكيەوە واتای (إزدحام)ی عەرەبی
ـەكورديدا وەرگرتووە . بەشێكی ديكە لەو ووشانەی كە دەنگی
[ق] يان تێدايەو خۆيان لەبنەڕەتدا كوردين لەئەنجامی گۆڕانی
ـەنگی [ك] ەوە هاتوون هەروەكو لەم ووشانەدا ديارن .

ـك ← لق
ـلكە كەس ← تاقە كەس
ـلكە مەڕ ← لاقەمەڕ
بچنە كون و كۆش بن ← بچنە قون و قوژبن

هەروەها چەند ووشەيە كيش هەن كە لە بنچينەدا كوردين و ناچنە پێڕستی ئەم ياسايەوەو بەشێوەيەكی ئاسايی ـەزمانی كوردی ئەمڕۆماندا بەكار دەهێنرێن وەكو : قاپ ، قەـ ، قوڕك ، قڕگە ، قژ ، بۆق .... هتد .

دەنگی [غ]ش ديسانەوە بەيەكێك لەدەنگە حوـزراوەكانی نێو زمانی كوردی دەژمێرێت خۆبە سەرنجدانی ـەو ووشانەی كە دەنگی [غ] يان تێدايە بۆمان دەردەكەوێت كە هەـێك ووشە هەن لەزمانی عەربی يان توركی يان فارسی يەوە وەرگيراون و هەندێكی ديكەشيان بنەچەيان ديارنيە بۆيە وامان ـ ـەكەن كە بەكورديیان بزانين بۆنمونە (قەراغ ، قەلغان ، ـعو ... هتد)

بۆ كۆتايی هێنان بەباس كردنی نارەسەنێتی چەند ـەنگێكی زمانی كوردی تەنها ئەوەندە بەسە كە بڵێن خواستن ـێن چاكتر بابڵێن بەرپا بوونی دەنگی نوێ لەهەر زمانێكدا ـەنەنگی ناژمێرێت بەتايبەتی بەڕێژەی زمانێكی وەكو كورديەوە

كە كاريگەريەكی بەردەوامی درێژخايانی چەند زمانێكی ديكەی ـەسەر بێت ولەگەڵ ئەوەشدا سنوورو سەربەخۆيی (ياساو ڕژێمی) خۆی پاراستبێت يان دەكرێت بەدێوێكی ديكەدا بەرپابوونی دەنگو سەرهەڵدانی بە هۆيەكی ديكەی وەكو

ديـاردەی نەشـونماكـردن و بەرەو پێش چـوونی ئەو زمـانـە بزانرێت .

دوا دەنگی نەبزوێن كە مابێت و بمانەوێت بە شێوەيەكی

خێرا سەرنجەكانمان ئاراستەبكەين لەم باسەدا دەنگی [y]ە ئەم دەنگە لەگەلێك زمانی وەكو ئينگليزيدا هەيەو دەنگزانانی زمانی ئينگليزی لەو بڕوايەدان كە لە تێكەڵاوبوونی دەنگەكانی [ing]ە وە هاتبێت بۆيە بە لێكدانی دوودەنگی [n,g] وێنەی دەنگيان بە ، شێوەی [y] بۆ كێشاوە ، دەتوانين ئەم دەنگە لە زمانی ئينگليزيدا لەووشەكانی (wrong, song, shining) بەدی بكەين كە ئەمەش ئەوە دەگەيەنێت ئەم دەنگە لەو زمانەدا سازگەی تايبەتی بۆ خۆی پەيدا كردبێت وبەتايبەت كە وێنەی

دەنگيشی بۆ كێشراوە هيچ جياوازيەكی لەتەك فۆنێمدا نەماوە ، هەمان دەنگيش بە هەمان شێوە لەزمانی كورديدا هەيە ـ لەگەڵ كەمێك جياوازيدا ـ دەتوانين لەووشەكانی (مانگ ، بانگ ، سەنگ ، دەنگ ... هتد) بەدی بكەين ، بيروڕای دەنگزانانی كورد دەربارەی ئەم دەنگە دەكرێت بەدوو بەشەوە هەندێكيان بە (ئەلەفۆن)و هەندێكی ديكەيان بە فۆنيمی لەخشتە دەدەن .

ئەوەی شايانی باسە ئەم دەنگە شێوەی لەئاوێستادا هەيەو لەبەر ئەوەش بەدەنگێكی ڕەسەنی نێو زمانی كوردی دادەنرێت ، لەتەك ئەمەشدا بوونی ئەم دەنگە لەفەرهەنگی دەنگسازی زمانی كورديماندا پێويستە چونكە گەلێك ووشە هەن وەكو (دەربەند) كە ديسانەوە لەتێكەڵاو بوونی دوودەنگی

[ن ،د]دا دەنگی [y] پێك دێت كەئەمەش ياريدە دەرێكی چاكە بۆئەوكەسانەی كە دەيانەوێت لەڕێگەی فەرهەنگی دەنگسازی زمانی كوردی‌يەوە فێری ئاخاوتنی زمانی كوردی ببن بۆئەوەی دوودەنگی [ن ،د] وەك ئاخێوەری كورد لەوجۆرە ووشانەدا بە [y] بئاخێون .

لە یادی « ٣٥ » ساڵەی کۆچی دوایی « پیرەمێرد » دا



# چەند لایەنێکی شاردراوە لە ژیانی ڕۆژنامەگەری پیرەمێردی نەمر

ئومێد ئاشنا

« بەشی یەکەم »

## - پیرەکورد - ی[1] ئەستەموڵ

ئەمساڵ سیو پێنج ساڵ تێپەڕی بەسەر کۆچیدوایی مرۆڤێکی شاعیرو ئەدیبو ڕۆژنامەنووسدا ، بەسەر کۆچیدوایی پیرەمێردی نەمردا .

پیرەمێرد پێشئەوەی بڕوات بۆ ئەستەموڵو لەنیشتمان دووربکەوێتەوە فەرمانبەربوە بەتایبەت - باشکاتب - بووە لە شارەزورو شارباژێڕو ماوەت . ئەوکاتانە لەهەڕەتی لاویدا بووەو هاوینان چوتە - گورگەدەر[2] - لەوێ زەویوزاری کشتو کاڵو باخیان هەبووە ، هەر لەسەرەتای تەمەنو بیرکردنەوەیدا پێش ڕۆیشتنی بۆ تورکیاو دوورکەوتنەوەی بۆماوەی « بیستو پێنج ساڵ »[3] لەولاتی خۆی ، وەك دوایی لەڕۆژنامەکەیدا دەنووسێت ، ئارەزوی لە کۆکردنەوەی شیعربووەو ئاوازەی پڕ ناڵەی نالی تێکەڵ بەسۆزی « بێسارانی » و « مەولەوی » بووە . بەتایبەت کاتێ لە هەڵەبجەبووەو بەسەرانسەری دەشتی شارەزووردا بەوپەڕی ئارەزوو ئاواتیەوە گەشتی کردوە . هەر لەوکاتەدا « تۆفیقی کوڕی مەحمود ئاغای هەمزاغای مەسرەف » ی باشکاتب کەشکۆڵێکی نایابی بۆخۆی پێکەوە ناوەو هەرچی شیعرێکی بەرگوێ کەوتبێ یاخود دەستی کەوتبێ لەو کەشکۆڵەدا نووسیویەتیەوە . کاتێك لە ساڵی « ١٨٩٨ »[4] دا ولاتی

بەجێهێشتوەو ڕوویکردۆتە ئەستەموڵ ئەو کەشکۆڵە پڕ بایەخەی لە سلێمانی لەماڵی خۆیان لەژێر زەوی‌دا بەجێهێشتووە . دەفتەرێك بیست‌و پێنج ساڵ لەژێر گڵدا شاردرابێتەوە دیارە سەرەنجامی چی‌لێدێت ! با بۆ ڕاستی ئەمە گوێ لە پیرەمێرد خۆی بگرین بزانین چی‌دەڵێت « نازانم چە دەردێك‌بوو بەمنەوە نووسابوو ، هەر لە منداڵیەوە من دڵم دابوە شیعرو گۆرانی ، دەنگی خۆشیشم لەبەر شیعری خۆش ئەویست ، تا مەولەوی ـ م نەناسیبوو نالی ـ م لەلا پێغەمبەری شیعری کوردی بوو[5] پێش‌ئەوەی بچمە ئەستەموڵ کەشکۆڵێکم نووسیبوەوە بە کاغەزی زەردو شین‌و سوورو مۆر هەرچی شاعیرێ کە بیستبوم چەند غەزەلێکی نایابی ئەوم نووسیبوەوە خەڵك‌و خوا ئەیان‌برد لەبەری بنووسنەوە تاقەتیان نەدەبوو هەر لاپەڕەیەکی شیعری خۆشی تیابوایە ئەیان‌پچڕی‌و دەریان دەهێنا ، تادوایی سوێندم‌خوارد بە کەسی‌نەدەم بەوەیش وازیان لێ‌نەهێنام ناچار لە ژووری‌ئەو خوارە چاڵە کەنمێکی ساڵی گرانیمان‌بوو خستمە چاڵەکەوە ، بەسەریا ڕۆیم ، بۆ ئەستەموڵ ، خوا ئەیزانێ لەو چاڵەدا وەك قامیشەنەیەکەی کە مەولانای ڕۆمی مەسنەوی لەسەر داناوە چەند بۆخۆی شەرحی جودایی داوە تا نەماوە . جا بەهۆی ئەوەوە کە شاعیرەکانم لەوێدا کۆکردبوەوە گەلێ ئەشعارو ئاساری ئەو ناودارانەم لەبیرمابوو لە سینەمدا نەقشیان بەستبو لە ئەستەموڵ لەغەزەتەی ـ ژین[6] دا برای ژیانی ئێستا بەزنجیرە هەندێکیم دەنووسین‌و ڕەنجیشم لەگەڵ ئەدان دیسان بە شیعر وەرم‌دەگێڕانە سەر تورکی »[7] . ئنجا مرۆڤێك بەو خولیایەوە ڕوو‌بکاتە ئەستەموڵی ئەو سەردەمە کە جێگای بەیەك گەیشتنی ڕۆشنبیری‌و زانستی ڕۆژهەڵاتی دواکەوتو وە ڕۆژئاوای پێشکەوتووبوو . ئەستەموڵی ئەوسەردەمە کە هەرچی مەنەوەرانی ئەم وڵاتە هەبوون دەست‌کردی بیرو ڕۆشنبیری ئەوێبوون . کەسێکی وەك تۆفیقی محمود ئاغا بەنیمچە خوێندەواریەوە ڕووی تێ‌کردوو ئەو ڕێگا سەختەی گرتەبەر وەك دەنووسێت « بەنیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم‌و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە »[8] یاخود دەنووسێت « ئێمە زۆرترمان لەوێوە پێگەیشتوین »[9] با لێرەدا بوەستین بزانین بەرنامەی نووسینەکەمان سەبارەت بەم مرۆڤە چۆن‌دەڕوات .

١ ـ ئەوەمان دیاری‌کرد کە پێش‌چوونی بۆ ئەستەموڵ کەڵکەڵەی شیعرو کۆکردنەوەی ناو کەشکۆڵی هەبووە .

٢ ـ ئەو کاتانە چووبێتە هەر جێگایەك هەوڵی‌داوە بەدوای شوێنەواری دێرینەدا بگەڕێت خۆی ڕاستی ئەمەمان بۆ ڕوون‌دەکاتەوە « لە پەنجا ساڵ بەولاترە لە هەڵەبجەبووم خۆم دابوە ئەمەی بزانم ئەو شارە کۆنانەو ئەو هەڵبەستە خرافاتە کەی‌بون لە کوێوە هاتون وەك ئەمەی ـ کۆی ئاتەشگا ـ کە زۆرتر مەولەوی لە گۆرانیەکانی خۆیدا ناوی‌بردوە »[10] ئەمە تۆفیقی مەحمود ئاغا هەتا تەمەنی سی‌و یەك « ٣١ »[11] ساڵی لە شارەزوورو شاربازێڕو کەربەلادا . هەر لەو تەمەنەدا بە عەشقی خوێندنی بەرزو خزمەت‌کردن‌و بینینی جیهانی نوێ لە کوردستانەوە دەچێتە ئەستەموڵ . وەزانای بەڕێز شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودی نەمری لەتەکدا دەبێت . هەردوو ساڵ پاشی ئەمە لە « ١٩٠٠ »[12] دا دەچێتە تەوافی کەعبەو دەبێتە حاجی توفیق . لە ڕێگای گەڕانەوەیدا ئەم بۆ تورکیاو ئەوان بۆ جێگای‌دی ئەم زاتانەشی بوونە هاوڕێ ، خۆی دەنووسێت « وەفایی ، کە لەپێشدا مەفتونی شیعرە جوانەکانی‌بووم وا ڕێك‌کەوت لە ماڵی خوایشا هاونالەو ئەفغانی‌بووم . لەپاش حەج لەڕێی حجازدا مردوو سەید ئەحمەدی خانەقا لەسەری بەندبوو ، تا ناشتنی ڕەفیقی گریانی‌بووم »[13] لە شامەوە بەرەو ژوور دەچێتەوە جیهانی نوێ . ئەو سەفەرە بیست‌و پێنج ساڵ دەخایەنێت بو سەلماندنی ڕاستی ئەم ژمارەیە لە گەڕانەوەیدا لە تورکیاوە بۆ عیراق لە شەمەندەفەردا ئەم شیعرە دەنووسێت وە لەسەرەتای شیعرەکەدا دەنووسێت « ئەم شیعرە لە گەڕانەوەدا لە « ترەنی »[14] ڕێی ئەستەموڵدا بێژراوە »[15] .

**« ئەوا ڕوم‌کردە تۆ ئەی دایکی موشفق بیست‌و پێنج ساڵە**
**لەغوربەتدا بەیادی تۆ ئەژیم خوا شاهیدی حاڵە »[16]**

لە ئەستەموڵ بەهۆی وریایی‌و زیرەکی خۆیەوەو یارمەتی‌دانی

« عزەت پاشای کاتب »[١٧] دەبێتە ئەندامی « مەجلیسی عالی » . وەکاری دیوانی سوڵتان عبدالحمید بەڕێوەدەبات نازناوی بەگی دەدەنێ و دەبێتە حاجی توفیق بەگ .

ئەگەرچی ئەم مرۆڤە دوور وڵاتەی لە وڵاتێکی دواکەوتوەوە بەبێ بڕوانامەی بەرزو خوێندنی موناسب ڕووی کردبوە ئەستەموڵی جێی شارستانی و خوێندنی بەرز بەڵام کاتێ زانرا لێهاتوەو ڕادەی هوشیاری باشە لە ـ کۆلێجی یاسا ناسی ـ وەرگیرا . بوە قوتابی و چوار ساڵ لەوێ خوێندی و بە پلەیەکی بەرز بڕوانامەی یاساناسی وەرگرت و بوە پارێزەر ـ محامی ـ و دەستی بەکار کرد ، بەلام ئەم لەهاوشان و هاوکارەکانی نەدەچوو ، خوی دایە نووسین و کاری ڕۆژنامە نووسین و کاری ڕۆژنامەگەری ، ئەو دوو خۆشەویستەی لە ناخیدا بە حەسرەتەوە بۆی دەژیا .

کۆمەلی هاوڕێی ڕۆژنامە نووس و ئەدیب و شاعیرو مێژوونووسی بۆ پەیدابوو ، وەك خۆی زۆرجار نووسیویەتی بەگشتی ناویانم کۆکردەوەو بریتی بوون لەم کەسانە « ئەمین فەیزی ، تۆفیق وەهبی ، ئەمین زەکی بەگ ، مستەفا پاشای یاموڵکی ، ئەشرەف هەمزە ، صالح زەکی بەگ ، مەعروف جیاوك ، عبدالله جەودەت ، شەریف سەهل پاشا ، کامەران بەدرخان ، جەلادەت بەدرخان ، شێخ مستەفای نەقیب ، شێخ مەحمود جەلالەدین کوڕی ئەحمەد د پاشای دوامیری بابان ، شێخ محمدی موفتی ، دوکتۆر فؤاد ، دکتۆر کەمال ، یوسف ضیا ، ئیبراهیم ئەفەندی ، زەکی مغامز ، ئەحمەد راسم ، ڕەزا توفیق ، خەلیل بەگ ، عبدالحق حامد ، مەلا سەعیدی بدیع الزمان ، ئەکرەم بەگی رجائی زادە ، مەمدوح وەفی[١٨] » .

لێرەدا پێویستە لەسەر ئەوە بوەستین و ڕوونی بکەینەوە بزانین لەماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەدا حاجی توفیق بەگی یاساناس و ڕۆژنامەگەرو ئەدیب چی کردوەو ئەو خزمەتانەی کردوونی چۆن کاری کردوتە سەر مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی ، وەك لەسەرەتای نووسینەکەمانەوە دیاریمان کردو بۆ ون نەکردنی ڕێبازێکی زانستیانە با گوێ لە ـ پیرەکورد ـ بگرین بزانین چی بۆکردووین .

١ ـ « دەمێکیشە غەزەتە چیم هەتا لە ئەستەمولیش غەزەتە چی بووم »[١٩] .

٢ ـ لە ئەستەموڵ لە غەزەتەی ژین ـ دا شیعری شاعیرە نەخوێندەوارەکانم نووسیبوو ـ امی شاعرلریمز[٢٠]

٣ ـ لە ڕۆژنامەی ـ شمس ـ دا کە لە ئەستەموڵ سەید حسین ئێرانی بە فارسی دەری دەکرد شیوەنێکم نووسیبوو[٢١] .

٤ ـ لە غەزەتەی ژین کە لە ئەستەموڵ دەردەچوو دوازدە ساڵ لەمەوپێش لەبەردە نووسراوەکەی ماوەت دوابووم[٢٢] .

٥ ـ لە ئەستەموڵ غەزەتەی ـ کورد ـ م دەردەهێنا لە غەزەتەی هەرەگەورەی ـ تان ـ ی فەرەنسەدا شیعری کوردیم ئەنووسی[٢٣] . هەروەها « ئێستا خوا دەرووی لێکردووینەوە ، گۆڤارو وێنەو کلێشەو چاپ کەوتۆتە ناومان ، نۆبەرەی غەزەتەمان لە ئەستەموڵ غەزەتەی ـ کورد ـ بوو . کە ئیمتیازی بەر من کەوت »[٢٤] .

٦ ـ لە ئەستەموڵ لە زەمانی عوسمانلیدا لە غەزەتەی ـ اقدام ـ دا بۆ ئاوەدانی شارەزوور بەهۆی ئیسکانی عەشائرەوە مەقالەیەکم نووسیوە زۆری تەئسیرکرد[٢٥] .

٧ ـ شیوەنیکم نووسیبوو ناردم بۆ ڕۆژنامەی ـ فەرهەنگ ـ کە لە تاران دەردەچوو سەرو ساختمان لەگەل یەکدا هەبوو[٢٦] .

٨ ـ لە پایتەختدا غەزەتەی کوردیم دەردەکرد . لە غەزەتەی ـ محیط مصور ـ ی میسرداو لە ڕۆژنامەی هەرەگەورەی پاریس ـ تان ـ و لە شەفەق سورخ و ـ فەرهەنگ ـ ی ئێراندا بانگی کوردیم ئەدا[٢٧] .

٩ ـ شاعیری مەشهوری فەرەنسە ـ لامارتین ـ مەدحێکی حەزرەتی محمدی کردبوو ـ ئیبراهیم ئەفەندی ـ بەشێوەیەکی وەك خۆی بەلیغ نەزمی کردبوو . من لە ئەستەموڵ لە غەزەتەی خۆمدا نەشرمکرد[٢٨] .

لەم نۆ خاڵەی سەرەوەدا دەگەینە ئەم ئەنجامانە : ـ

١ ـ حاجی توفیق بەگی پارێزەر لە ئەستەموڵدا خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری ڕۆژنامەی ـ کورد ـ بووە . ئەم ڕۆژنامەیە بە زمانی کوردی و تورکی دەرچووە . ڕاگەیەنەری دەنگی سیاسی ـ کۆمەڵەی کورد ـ بووە . هەفتەی جارێك دەرچووە .

٢ ـ لە ڕۆژنامەی ـ ژین ـ ی ئەستەموڵدا کە خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەری ـ ئەشرەف هەمزە ـ بووە بەشداریەکی بەردەوامی کردوەو گۆشەیەکی هەبوە بەناوی شاعیرە نەخوێندەوارەکانمان .

٣ - له ڕۆژنامەی سەیدحسەینی ئێرانیدا کە ناوی - شمس - بوە بە فارسی شیعرو نووسینی کوردی بڵاوکردوتەوە .

٤ - بەشیعرو نووسینو وەرگێران لەم گۆڤارو ڕۆژنامانەدا بەشداریکردوە . بەسێ زمان . کوردیو تورکی، فارسی . إقدام ، محیط مصوری میسر ، تان - ی فەرەنسی ، شەفەق سورخو فەرهەنگی ئێرانی . لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا بە سێ ناوەوە دەرکەوتوە .

**١ - سلێمانلی توفیق . ٢ - س . ت . ٣ - پیرە کورد :**

-ەتوانین بڵێین ئەگەر کەسێک مەبەستێکی گەورەو خۆشەویستی خاکو میللەتی خۆی لە هەست وبیردا نەچەسپی بێو بۆی نەژیابێت هەرگیز ناتوانێت ئا بەو ڕەنگە بێتە پێشەوەو هەموو خۆشیەکی ژیانی خۆی بنێتە پێناوی ڕۆژنامەگەریو نووسین وەرگێرانەوە . وە لە جێگایەکی وەکو ئەستەموڵدا دەنگی میللەتە دواکەوتوەکەی خۆی بەجیهان بگەیەنێو ئەوە بسەلمێنێت کە کوردیش وەک گەلانی جیهان خاوەن ئەدەبو ڕۆشنبیریو کەلەپوری نەتەوایەتیە . وەهەر ئەم سەرچڵو گیانە نەتەوەیە بوو کە لە ساڵی ١٩٢٣ - دا بوە هۆی ئەوەی حیزبی - اتحادو ترقی - لەسەر بەرپابوونی شۆڕشی کوردستانی تورکیاو بەشداریکردنی حاجی توفیق لە کۆمەڵەی کورددا فەرمانی خنکاندنی دەربکاتو ئەویش بەپەلەو خێرا بگاتەوە عیراق . ڕەنگە لای زۆر کەس ئەم ڕاستیە جێیخۆی نەکاتەوە کە ئایا حاجی توفیق بەشداری کاری سیاسی کردبێ لە کوردستانی تورکیادا . بۆ سەلماندنی ئەمڕاستیە خۆی دەنووسێت «لە سەورەو کۆمیتەی ئەرزرۆمی کورداندا لەگەڵ خالد بەگو یوسف ضیاو دکتور فوادو کەمالدا لەخزمەت مەلا سەعید بدیع الزماندا ڕەنجمنەداو ئیدارەی عورفیەی ئەستەموڵ بە ئیعدام مەحکومی کردم »[29] . واتە حاجی توفیق لەبەرانبەر ڕژێمی ئەتاتورکو حیزبی - اتحادو ترقی - بەوە داواکراوە بۆ دادگاو پاشان - غیاب - یەن حوکمدراوە .

لایەنێکیتریش کە هەتا ئەم دواییە ئاشکرا نەبووبوو ئەوەیە کە ئایا جگە لەناوی - سلێمانلی توفیق - و - س . ت - بەچ نازناوێکی کەوە دەرکەوتوە ؟! . بڕوانە ئەم نووسینە . « لە ژمارە (١٢) ی ڕۆژنامەی - ژین - ی ئەستەموڵی ساڵی (١٣٣٥) ڕێکەوتی (١٩١٩) ی زاینی کە خاوەن ئیمتیازو ڕێبەری لێپرسراوی کەڵە ڕۆژنامە نووسی کورد - ئەشرەف هەمزە - بوو ، حاجی توفیق پیرەمێردی نەمر کە ئەوسا نازناوی - پیرە کورد - ی لەخۆی ناوە لەپاڵ وتارێکی زۆر شیرینو گەرمو بەجۆش بەزمانی تورکیو بەناوی - لێهاتوییو زیرەکی کورد - و بۆ یەکەمجار دەقێکی ناتەواوی - گڵکۆی تازەی لەیل - ی بەنێوی حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە بڵاوکردوتەوە . پیرەمێردی - پیرە کورد - لە وتارەکەیدا بەکورتی باسی بلیمەتیو بەهرەمەندی ئادەمزادی کورد ئەکاتو ئنجا دێتە سەر باسی بلیمەتی حەسەن کەنۆشو حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە - و لەتەکیشیا خەمساردی کوردنیشان دەدات کەچۆن بایەخیان بە کەڵە شاعیرانی خۆیان نەداوە تا دێتە سەر باسکردنی - نالی - شێخ مارف نۆدێ ، کاک ئەحمەدو مەولانا خالدو مەولەوی ، مستەفا بەگ - حاجی قادر ، عەلی بەردەشانی ، ئەحمەدی کۆر ، ڕەنجوری ، شێخ ڕەزای تاڵەبانی ... هتد »[30] . نووسەری ئەم چەند دێرەی پێشو کاک محمود زامدار - ە کە ساڵی ١٩٨٤ لە ڕۆژنامەی - العراق[31] - دا نووسیبوی نووسەر دوو پرسیاری کردوەو بۆئەوەی بێوەڵام نەمێنێتەوە وەڵامیان دەدەمەوە . دەپرسێت ١ - ئایا ئەو قەسیدەیەی نالی کامەبوە کە حاجی توفیقی پیرە کورد بە زمانی فەرەنسی لە ڕۆژنامەدا بڵاویکردوتەوە ؟

٢ - ئایا لەکام ڕۆژنامەدا بوەو ئاخۆ کێ گۆڕیبیەتیە سەر زمانی فەرەنسی ؟

لە وەڵامدا دەڵێین .

١ - ئەو قەسیدەیە بریتیبوە لە قەسیدە بەناوبانگەکەی نالی کە بەم بەیتە دەست پێدەکات .

**« لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان**
**بەیانیدا سفیدەی باغی سێوان »[32]**

بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەمە پیرەمێرد خۆیەتی دەڵێت « یەک دوو شیعری نالی بۆ سنعەت دەنووسین ، بزانین کێ توانیویە ئەو شێوەیە بنوسێ ؟! غەزەلێکی هەیە کە پیرەمێرد لە ساڵی ١٣١٩ دا لە ئەستەموڵەوە بە فرانسزی ناردویە بۆ غەزەتەی - تان ی پایتەختی فرانسە - پارس - کە دەڵێ .

**لەدوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان »[33]**

٢ - ئەو کەسەی کە نەک هەر ئەو شیعرەی نالی بەڵکە شیعرێکی - لامارتین - و گەلێ نووسینی تریشی لە کوردیەوە کردوە بە

فەرەنسی و بەپێچەوانەشەوە ناوی ـ داود ـ کوڕی ئیبراهیم ئەفەندی ئەدیبی ناسراوی کوردبوە لە تورکیا . با گوێ لە پیرەمێرد بگرین « لەپاش برنادشۆ شاعیرێکی فەرانسە ـ لامارتین ـ قەسیدەیەکی محەمەدی بە فرنسزی وتبوو مەرحومی جەننەت مەکان ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری شیخ الاسلام لەسەر ئەو تەرجەمەیەی ـ داود ـ ی کوڕی بۆی کردبوو ئەو بە تورکی نەزمو تەرتیبی کرد . منیش لە غەزەتەی ئەستەمولی خۆمدا کە ناوی ـ کورد ـ بوو نەشرم کرد »[٣٤] « ئیبراهیم ئەفەندی لە عیراقیشدا بە کەمالو حورمەتو ئارەزوی خۆی ڕای بوارد »[٣٥] لەدوای ئەم سەلماندنەی پیرەمێرد دەتوانین بڵێین کە وەرگێر ـ داود ـ بوەو ئیبراهیم ئەفەندی باوکیشی کە ئەدیب بوە بە شیعرو پەخشان بەرهەمە وەرگێراوەکانی ڕێک خستۆتەوە . پیرەمێردیش کە هەستی کردوە ئەدەب نیشانەی زیندوێتی نەتەوەکەی و هەنگاوی پێشکەوتنیەتی و ناساندنی بە گەلانی دیکە ناساندنی نەتەوە دواکەوتوەکەیەتی بۆ یەکا لە بلاوکردنەوەی ناوو بەرهەمی ئەدەبی ئەو شاعیرانە دریغی نەکردوە . جگەلەمانەش بەپێی بەڵگەی نووسینی خۆی پیرە کوردی ئەستەمول ئەم کارە گرنگانەشی ڕاپەڕاندوە .

١ ـ هەوڵدان بۆ دانانی دەستورێك بۆ زمانی کوردی . خۆی دەنووسێت « لە ساڵی ١٣٢٩ ی ڕۆمیدا کە لە ئەستەمول غەزەتەی کوردی دەردەچوو من لە چۆلەمێرگەوە مەقالەیەکم بۆناردبوون و تەکلیفم لە جەمعیەتی کورد کردبوو کە لەهەر دیارێکی کوردستانەوە زبان زانێك بانگ بکەنە پایتەختو زبانێك بۆ عمومی کورد هەڵبژێرن و بیکەن بە فەرهەنگ وە دەستوور هەتا مصارفاتی لە چاپدانیشم گرتبوە ئەستۆی خۆم . کەس گوێی نەدایە ، ئێستا هەرکەسە بەهەوەسی خۆی شێوەیەك دێنێتە کارەوە ، وایان شێواندوە . بەم بەستەزبانی و بێ ژیانیەوە چەلافێك لێبدەین ؟ بۆچ کوردستان تەنها ئەم هۆمەرە کوێرەیە[٣٦] ؟! بۆچ کوردستانی گەورە لە زبانمان نەگا ؟! »[٣٧] .

٢ ـ هەوڵدان بۆ چەسپاندنی زمانی ئەدەبی یەك گرتوی کورد وەك دەنووسێت « زبانی کوردی بەڕەنگێ شێواوە من کوردم کەچی لەڕۆخی وان و هەکاری تەرجەمانم بۆ کوردی ئەوێ ڕادەگرت . لەم بن دەستەوە هەورامی لەزبانی جاف ناگا . ئەو هەموو موحیتی کوردستانە کەمن باوەڕم وایە تا زبانیان یەك نەکەوێ یەك ناکەون ئەمەندە هونەرمەندی زبان زان و قواعد شناسی تیا هەڵکەوت ئەهمیەتێکیان بە زمان نەدا »[٣٨]

٣ ـ هەوڵدان لەگەڵ ئەمین فەیزیدا بۆ دانانی کتێبێك کە شیعری شاعیرە ناسراوەکانی کوردی تێدا کۆببێتەوە . ئەوەبوو لەگەڵ ئەمین فەیزی بەگدا دەست دەکەن بە ئامادەکردنی کتێبی ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد ـ بەلام لەکاتی کارکردندا سەبارەت بە زەوقی ئەدەبی و هەڵبژاردنی شیعری شاعیران ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان بیروڕایان ڕێکەناکەوێ و لەیەکتر جوێ دەبنەوە . بەلام ئەمین فەیزی وەك لەم دواییەدا بینیمان لە ئەستەمول کتێبەکە لە چاپ دەدات . پیرەمێرد دەنووسێت « لە ئەستەمول لەگەڵ ئەمین فەیزی مەرحومدا قەرار وابوو لە ئەنجومەنی ئەدیباندا ئیشتراکی بکەم ، لەسەر ئەم ئیختلاف زەوق و هەڵبژاردنی پایەی شاعیرانە لێك جوێ بوینەوە »[٣٩] لێرەدا دەتوانین بڵێین پیرەمێرد سەرچاوەیەك بووە کە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمەی تورکیا ڕویان تێ کردوە ئەمیش بەدەوری خۆی کۆی کردونەتەوەو تەنانەت مەسەلەی سیاسەت و کوردایەتی هێناوەتە کاری ڕۆژنامەگەریەوەو بەیەکتری ئاوێتە کردوون . هەوڵی داوە بۆ دەستوری زمانی کوردی کە پێك بێت و ڕێنوسێکی ڕاست ڕەچاو بکرێت . لە وتارەکانیدا هەوڵی داوە لە تورکیاوە باسی کوردستان بکات و ناتەواوی و گیروگرفتەکانی ئاشکرا بکات . لەڕوی مێژوییەوە خزمەتی زۆرەو ئەگەر نووسینە مێژوییەکانی کۆبکرێنەوە کتێبێك دروست دەکات لەسەر مێژوی کورد . لەڕوی چاکی و مرۆڤانەوە کاری لە منالەکانی کردوە لە تورکیا واتە هەردوو کوڕەکەی . نەژاد ـ یان دەبێتە شاعیرو پەخشان نووس ، ـ وداد ـ یان دەبێتە پسپۆڕ لە زمانی سانسکریتیدا لە هیندستان . ئەمە دوو نمونەی نووسینی خۆیەتی لەم بارەیەوە « عبدالله جەودەت ـ کە لەپاش مەشروتیەت لە ئەورووپاوە هاتەوە لە ئەستەمول بوو زۆرتر لە هەموو کەس من لەخزمەتیا ئەبووم . خۆم و نەژادی کوڕم بە ـ نظم و نثر ـ لە مجەلەکەیدا

خزمەتمان هەیە »[40] « جەمعیەتێکی ئەنسکلۆبیدی لە تورکیە ێکخرابوو لە دانشمەنـدانی گشت میللەتێك پێكهاتبـو ، ڕۆفیسۆرێکی ئەڵمانیان هەڵبژاردبوو سـەرۆكبێت ـ ودادی ـ کوڕی منیش بەشداربوو »[41] هـەوڵیداوە لەگەڵ شـاعیرانی وڵاتـانیکەدا پـەیوەنـدی بکاتو بـاسی ئەدەبو ڕۆشنبیـری کوردیان بۆبکات . بـۆ نمونـە کێ باوەڕدەکـات پیرە کـوردی سلێمـانـی هـاوڕێی ئـەدەبیی عـبـدالحـق حـامـد ـ .[42] ڕابـەری شیعری نـوێی تورکی بـوبێ ؟؟ وە عبدالحق حامد ـ هێندە نووسینی ئەمی لاپەسەندبووە کە پەخشانێکی پیرەمێرد دەکـات بە شیعـرو بـڵاویدەکـاتـەوە پیـرەکـورد دەنـووسێت « لە غەزەتـەی کـۆندا بـەنـدێکی پـەخشـانیم بەرچاوکەوت کە لەوەختی کـۆندا لای عبدالحق حـامد ـ ی شـاعیری مەزنی تورك ـ دەمودەست بە تورکی نـەزمکرابـوو بەتەرزێـك کە گـوایە لە کـەس وەرنەگیـراوەو نەبیستـراوە . ـ عبدالحق ـ یش زۆری پەسەندکـردوە . ئنجا دوای چـەند ساڵێك لێرە کراوە بـە کوردی . سـاهەرچـۆنبێ ئەو بـەندی پەخشانە ـ شیعری منثور ـ ە کۆنە ڕۆحمی تازە کردەوەو تەنها بو یادی کۆنی خۆم تازەمکردەوە »[43] وەتەواوی ئەو پەخشانە ی ئێمە هەیەو پیرەمێرد دووجار لە ڕۆژنامەی ژیـانو ژیندا بڵاویکردوەتەوە ساڵی (١٩٣٤) وە ساڵی (١٩٤٩) جاری یەکەم بەناوی ـ ئاوات خوازی ـ وە جاری دوەم بەناوی ـ کایکۆن ـ ەوە بڵاوکردۆتەوە . وەپێویستە بوترێت کە زۆر لەو ڕۆژهەڵات ناسانـەی دەربارەی کـوردو ئەدەبی کـورد نووسیـویانـە لە ئەرشیفی کتێبخانەکانی ئەستەمولدا سودیان لەم نووسینانەی پیرەمێرد وەرگـرتوە . خـۆ ئەگـەریش ڕۆژگار کـارێکی کـرد ئەدیبێکی کورد دەستی بگـاتە ئـەو گۆڤـارو ڕۆژنامـانە ئـەوا ئەمەندە زانیاری نوێو نەبیستراومان بۆ دێنێتەوە کە خۆمان سەرسوڕمانەکەینو لەتوانای لەبن نەهاتوی ئـەم مرۆڤـە گەورەیـە سەرسامبین .

« بەشی دووەم »

ئاشکرایە کە زەمینەی لەبارو ژیانی ئارام بەتایبەت بۆ ئەدیبو هونەرمەند دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەردەوام بۆ ئیشەکەی خۆی بژیو کارە لاوەکیەکانی بیـرو هەستی پـەرتوبڵاو نـەکەنو قـەڵەمی داهێنانی کـول نەکـەن . تاقی کـردنـەوەی ژیـانی ڕۆشنبیرانی جیهان بۆیسەلمـاندوین کـە ئەو جـۆرە ئارامیـە هونەرمەندی گەورەی پێگەیاندوە ، بەپێچەوانەی ئەمەشەوە چورتمەکانی ژیانو گیروگرفتە سەختـەکانی کـارێکی نالەبـار دەکەنە سەر داهێنانو بەرهەم . ئەگەریش تەماشای مێژوی ئەدەبیاتی کورد بکەین هەرلەسەرەتاوە بۆمان دەردەکەوێت کە نـووسەرو ڕۆشنبیـری کورد هیـچکات نـە زەمینەی لەبـاری بەدڵیخۆی بۆخولقاوە نە لەژیـانێکی وەها ئـارامیشدابـوە کە هەموو ساتێکی ژیانی تەنها بیـرکردنـەوەو داهێنان بـووبێ . لەگەڵئەوەشدا کۆڵینەداوەوە خاوەن داهێنانو بەرهەمبووە . هەرچەندە باری نائاساییو دواکەوتوی دەورو پشتو ئەرکی ژیانو گوزەران تـوانیویـانە بـەشێك لە داهێنـانو بەرهـەمی بۆخۆیان بەرنو لێیدابڕن بەلام شاعیرو ئەدیبی کورد ئازایانە لەبەرانبەریا وەستاوەو قەڵەمی دانەناوە . بەگشتی پیرەمێرد زۆربەی ژیانی لەبارو خۆش بەختانەبوە بـۆ کاری نـووسینو ڕۆژنامەگەریو خەیاڵی شیعر . ئایا ئەگەر پیرەمێرد بە عەشقی فێربوونو تێگەیشتنو پێگەیشتن ڕووینەکردایەتە وڵاتێکی وەهـا دوورو بیستو پێنـج سـاڵ تـەمـەنی لە غـەریـبی بـەسەرنـەبردایـە دوور لە وڵاتو ـ غـەزالەخـانی ـ ژنیو ـ ڕەحمەخان ـ ی تەمەن یەك دوو ساڵانەی کچیو هەر بەنیوە خـوێندەواریـەکەوە لە سلێمـانی بمایـەوە دەبوە پیـرەکوردی ئەستەمولو پیرەمێردی سلێمانی ؟! وەلام دیارەو ئەم مـرۆڤە قوربانی داوە ، لە ڕێگایەکدا کە ڕێگەی خزمەتو تێگەیشتنو پێگەیشتنە . لە ڕۆشنایی وتەکانی پیرەکوردی ئەستەمول خۆیو هاوڕێکانی ئەوییدا دەتوانین ژیانی بکەین بە دووبەشەوە .

**١ ـ ژیانێکی ئارامو زەمینەیەکی لەبار بۆ کارکردن .**

**٢ ـ بەشێکی گیروگرفتو گرتنو فـەرمان بـەسەردانو مەسەلەی سیاسی کۆمەڵەی کورد ـ لە تورکیا .**

لەسەرەتای ژیانیدا لە تورکیا بە ئارامی ژیاوە ، بۆیلواوە بـە ئـارەزویخـۆی بخـوێنێتـەوەو بنـووسێت . ببێتـە میـوانی هەمیشەیی کتێبخانەی بایەزید کە ئـەو ڕۆژگارە لە کتێبخـانە بەناوبانگەکانی جیهانبووە . وەك خۆی دەڵێت بۆ یەکـەمجار لەوێ ـ شەرەفنامە ـ ی خوێندۆتەوە . لە نۆ گۆڤارو ڕۆژنامەی

جۆربەجۆردا بەشداری‌کردوە بەردەوام شیعرو نووسین‌و وەرگێڕانی هەبوە . ژیانی هێمن‌و خۆش‌بەختانەی ماوەی داهێنان‌و کارکردنیان زۆر کردوە . باوکێکی مامۆستابوە بۆ هەردوو کوڕەکەی نەژادو وداد کە پێشتر باسمان‌کردن . هاوڕێکانی هەڵبژاردەو نمونەی پیاوانی ئەدیب‌و شاعیرو ڕۆژنامەنووس‌و ڕابەرانی سیاسی ئەو ڕۆژگارەبوون . لەوپەڕی دەسەلات‌و خۆش‌گوزەرانی ژیانیدا دڵی لای باخ‌و کوێرە دێیەکی کوردستانەکەی‌بووە بڕوانە دەنووسێت « لە ئەستەمول بەڕوتبەو نیشان‌و ئەعزایەتی مەجلیسی عالی‌یەوە لە - أطه - کە مەڵبەندی پرنسەکانی کۆنی ڕۆم‌بوو لە قەسرێکی مومتازدا دائەنیشتم کە شەو ئەنووستم لە خەوما لە گورگەدەر لەباخەکەی شێخ ئەحمەدی بازلیخا هەنارم ئەدزی »[٤٤] . هەر لەم ڕوەوە دیسان دەڵێت « لەدەورەی خولیای شەبابدا کەوتمە ئەستەمول . یەکەمجار لە - أطه - دراوسێی - رجائی زادە ئەکرەم بەگ‌و- عشاقی زادە خالد ضیا - و- حسین ڕەحمی - بووم ، ڕەزا توفیق - یشیان پێناسیم . کەوتمە بەهەشتی سەروەتی فنونەوە ، کە ئێواران لە ئەستەمولەوە بە واپۆڕ ئەگەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم کە - أطه - بوو وە سەروەتی فنونم لەکۆکرتەی ئەو واپۆڕی سەر دەریای مەرمەڕیەدا ئەخوێندەوە ، تەئسیری ئەو شیعرو ئەدەبیاتە لە سندبادی بەحری زیاتر ئەیخستمە دەریای خولیاوەو لە غرامەفۆندا کە گوێم لە نەغمەی بەستەی خۆم ئەگرت کە بۆ - مهر النسا - م وتبوو ڕۆحم ئەچوە تەختی سلێمانی . وام‌ئەزانی فریشتەی ئاسمان‌و پەری سەر کێوی قاف گوێ لە دەنگی شیعری من ئەگرن . هەندێ‌جار شەوی مانگەشەو کە ئەچوومە کەنار دەریاو تریفەی مانگ ئەیدا لەو ئاوەو جریوەی نازو غەمزەی ئەو کچە ڕۆمە دولبەرانە ئەفسونمی ئەو ئەفسون گەرانەم ئەبیست لەهیچە ئەکەوتمە خولیای شیعرەوە . وام ئەزانی گوڵ بۆیە ئارایشتی خۆی ئەدا من شیعری پیاهەڵدەم ، بولبول بۆیە بەدەوریا ئەسوڕێتەوە شیعری منی بەسەرا بخوێنێتەوە »[٤٥] . ئەمە ئەو بەشە پڕ ئارامی‌و خۆش‌بەختیەی پیرەکوردبوو کە بۆمان ڕوون‌بوەو تەنانەت جێگای وەزیفەی ژیانی لە دوورگەیەکی زۆر خۆش‌و ڕازاوەدابوە کە خۆی یەکێکە لە هاوینەهەوارەکانی تورکیا . وە دیسان خۆشی شاعیرانە ژیاوەو شاعیرانەش باسی ئەو ژیانەی کردوە ، بەلام ئەم ژیانەی هەروا بۆنەچوەسەر ، گیانی نەتەوایەتی‌و نیشتمان‌پەروەری ڕۆژ بەڕۆژ لای ئەو گەورەترو بڵنددەبوو . ئەو دایکی موشفیقەی ساڵەهابوو لێی دوور - بوو شەوان لەخەوەکانیا نوێ‌دەبوەوەو لەجارانی جوانتردەبوو ئەمیش دێوانە ئاسای ئەو عەشقە نەمرە دەچووە خەڵوەتەوە نەك تەنها بۆ گریان‌و یادکردن بەڵکە بۆ زیاتر شکۆدارکردنی بە شیعر ، بە نووسین ، بە وەرگێڕان - دوایش بەخەباتی سیاسی بەبێ سڵ‌کردنەوە . هەتا ئەوکاتەی لە کوردستانی تورکیاوە دەنگی شۆڕش بەرەو ئەستەمولی پایتەخت‌و هەموو لایەك پەخش‌و بلاوبوەوە . ئەمە زیاتر ڕۆشنبیرە کوردەکانی ئەستەمولی بزواند ، هانی‌دان ، یەکێك لەو گیانە نەمرانە پیرەمێردبوو بۆ سەلماندنی ڕاستیمان - مەعروف جیاوك - ی نیشتمان پەروەرو ئەدیب دەنووسێت « لە ساڵی ١٣١٨ ی ڕۆمی‌دا لە ئەستەمول بەڕێکەوت لە ماڵی شەریف سەهل پاشادا یەك گیربووین ، وابزانم تەبیعەتیشمان لەدوو نوقتەی موهیمدا ڕێك‌کەوت ، یەکێکیان سەربزێوی میللیەت ، دوەمیان زەوقی ئەدەبی‌بوو »[٤٦] ئنجا لەم واتەیەی مەعروف جیاوکەوە دەردەکەوێت کە سەربزێوی میللیەت دەبێ لای ئەدیبێك چۆن بکەوێتەوە . هەر ئەم گیانەبوو کە پاڵی پێوەناو خەباتی ژێرزەمینی‌ی پیرەکورد ئاشکرابوو وەخرایە بەندیخانەوە . خۆی دەنووسێت « هەندێ شت هەیە بە ترس‌و لەرزو تەهلەکە تێ‌دەپەڕێ کەچی لەپاش چەند ساڵێك کە یادی ئەکەیتەوە وەك چووبی بۆ سەیران وا ئەیگێڕیتەوە ، من خۆم ئەمانەم بەسەرهاتوە . کە لە زیندانی ژێر زەمینی بلوکی بەکر ئاغای ئەستەمول گیرابووم بەیعی خنکاندنم‌بوو ، ئێستا کە ئەیگێڕمەوە ئەمەندە بەلەزەتە وەك لەڕاووشکارو دۆشەکی نەرمی ‌یارابووبم وایە »[٤٧] جارێکی‌تریش ئەم گرتن‌و فەرمانی خنکاندنە سەرلەنوێ تووشی دەبێتەوەو لەگەڵ پەرەسەندنی شۆڕشەکەدا دەسەلاتی دوژمن بە کوردی ئەتاتورك‌و حیزبی - اتحادو ترقی - داوای‌دەکەن بۆدادگاو ئەم خۆی ون‌دەکات‌و دەگەڕێتەوە بۆ عیراق ئەوانیش بەشێوەی

- غیاب - ی حوکمی خنکاندنی دەردەکەن ، پیرەمێرد باسی ئەمە دەکات و دەنووسێت « لە سەورەو کۆمیتەی ئەرزڕۆمی کوردا لە خزمەت مەلا سەعیدی بدیع الزمان دا ڕەنجم دەدا ، ئیدارەی عورفیەی ئەستەموڵ بە ئیعدام مەحکومی کردم »[48] بەم شێوەیە ئەم مرۆڤە لە سالانێکی وەهادا کە کۆمەڵی کوردەواری لە هەموو لایەکدا دەی نالاند بەدەست باری دواکەوتویی کۆمەلایەتی و دەسەلاتی زۆر داری دەرەبەگ و ئاغاکانەوە سەرباری هەموی چەوساندنەوەی دوولایەنی و زەبروزۆری ڕژێمە کۆنەپەرستەکانیش لەو سالانەدا پەروەردابوون ، کەسێکی وەك - تۆفیقی مەحمود ئاغا - هەموو خۆشی گوزەران و لانەی ئارامی خێزانەکەی خۆی تێکداو هەواری تێکۆشان و نیشتمان پەروەری و خزمەتی ئەدەبیاتی کوردی لە ئەستەموڵەوە گواستەوە بۆ عیراق و لە خاکی سلێمانی دا ژیایەوەو بوە پیرەمێردی سلێمانی .

سەرچاوەکان :

١ - پیرەکورد - پیرەمێرد - حاجی توفیق بەگی مەحمەد بەگی هەمزاغای مەسرەف - زیاتر لە ڕۆژنامەی ژین - ی ئەستەموڵ دا بەناوی - پیرەکورد - ەوە نووسیویەتی .

٢ - گورگەدەر - دێیەکە لە ناوچەی شاربازێڕی نزیك سلێمانی .

٣ - بڕوانە سەرەتای شیعری -

« ئەوا ڕوم کردە تۆ ئەی دایکی موشفق بیست و پێنج ساڵە
لە غوربەتدا بەیادی تۆ ئەژیم خواشاهیدی حاڵە »

٤ - ١٨٩٨ - لەو ساڵەدا ڕۆیشتوە بۆ تورکیاو لە (١٩٠٠) دا لەتەك شێخ سەعید - دا دەچێت بۆ حەج بۆ مەکە .

٥ - لەم واتایە مەبەست ئەوە نی یە دوای ناسینی مەولەوی نرخ و بایەخی نالی - لای ئەم کەم بوو بێتەوە .

٦ - ژین - ی ئەستەموڵ ،، بڕوانە ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی - جەمال خەزنەدار .

٧ - ژیان ژمارە ٥٤٧ ك ٢ ١٩٣٨ .

٨ - پیرەمێردی نەمر لاپەڕە (٢٠) ئامادەکرد نی م .هاوار .

٩ - ژین ژمارە (٨٩٣) ساڵی ١٩٤٧ .

١٠ - ژین ژمارە ٦٨٩ ساڵی ١٩٤٣ .

١١ - ١٨٦٧ هەتا ڕۆیشتنی لە ١٨٩٨ دا دەکاتە ٣١ ساڵ .

١٢ - پیرەمێردی نەمر . م . هاوار لاپەڕە ١٣ .

١٣ - ژین ژمارە (١٠٠٦) ساڵی ١٩٥٠ .

١٤ - ترەنی لە ترەین - ی ئینگلیزیەوە train شەمەندەفەر .

١٥ - ژیان ژمارە ٣٦ ئەیلولی ١٩٢٦ .

١٦ - هەمان سەرچاوە .

١٧ - پیرە مێردی نەمر - م هاوار - لاپەڕە ١٤ .

١٨ - لە ژیانی (١٩٣٢) بەدواوە هەتا (١٩٥٠) بەجیاواز ناوی ئەم زاتانە هاتووە .

١٩ - ژیان ژمارە (٥١٣) ١٩٣٧ .

٢٠ - ژین ژمارە (٧٧٥) ١٩٤٥ .

٢١ - ژین ژمارە (٧٦٨) ١٩٤٤ .

٢٢ - ژین ژمارە (٤٣٠) ١٩٣٥ .

٢٣ - ژین ژمارە (٩٤٨) ساڵی ١٩٤٨ .

٢٤ - پەخشانی کەلاوێژ پێنج ساڵانە کەلاوێژ ك ٢ ١٩٤٦ .

٢٥ - ژیان (٥٣٥) ساڵی ١٩٣٧ .

٢٦ - ژین ژمارە (٧٦٨) ١٩٤٤ .

٢٧ - ژین ژمارە (٩٥٣) شوباتی ١٩٤٩ .

٢٨ - ژین ژمارە (٧٢٣) ١٩٤٣ .

٢٩ - ژین ژمارە (٩٥٣) شوباتی ١٩٤٩ .

٣٠ - ڕۆژنامەی العراق ٢٢/٨/١٩٨٤ - نالی و سەرچاوەیەك .

٣١ - هەمان سەرچاوە . محمود زامدار .

٣٢ - دیوانی نالی مەلاعبدالکریم - ی مدرس .

٣٣ - ژین ژمارە (٨٦٠) شوباتی ١٩٤٧ .

٣٤ - ژین ژمارە (٩٨١) ١٩٤٩ .

٣٥ - هەمان سەرچاوە .

٣٦ - هۆمەرە کۆیر - جێگایەکی نزیك سلێمانی یە .

٣٧ - ژین ژمارە (٦٧٩) ساڵی ١٩٤٢ .

٣٨ - هەمان سەرچاوە .

٣٩ - ژین ژمارە (٨٨٨) ساڵی ١٩٤٧ .

٤٠ - ژین (٦٧٩) ١٩٤٢ .

٤١ - ژین ژمارە (٩٣٩) ساڵی ١٩٤٨ .

٤٢ - عبدالحق حامد - لە شاعیرانی نوێی ماوەی وریابوونەوەیە لە ئەدەبی تورکی دا .

٤٣ - ژین (٩٨٣) ساڵی ١٩٤٩ .

٤٤ - ژین ژمارە (٨٩٤) ت ٢ ١٩٤٧ .

٤٥ - ژین (٩٦٧) حوزەیرانی ١٩٤٩ .

٤٦ - ژین (٨٢٠) ١٩٤٦ .

٤٧ - ژین (٨٨٣) ئابی ١٩٤١ .

٤٨ - ژین ژمارە (٩٥٣) شوباتی ١٩٤٩ .

« بۆ کاروانی » خۆشەویست

# هونراوەیێک لە روانگەی تەصەووفەوە

ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی

(١) لەرێبوارانی رێگەی خۆشەویستیم
غولامی گەردی قاپی عیشق و مەستیم

(٢) لەکینەو خۆپەرستی‌ی دڵ ئەشۆرم[١]
عەزیزم خاکساری تۆپەرستیم[٢]

(٣) لەوەی دڵ بویە جێگەی تیشکی رووی تۆ[٣]
بەنرخ و بایی‌یە لام ، ژین و هەستیم

(٤) ئەمانەت[٤] ، گەوهەری عیشقەو لەلامە
ئەمین‌دارو ئەوین‌داری ئەلەستیم[٥]

(٥) ئەوەی هەڵقەی غولامی‌ی تۆم لەگوێیە
سەرم بەرزەو نەماوە دردو پەستیم

(٦) فیدای ساتێکی دیدارت عەزیزم
دڵ و گیان و ژیان و هەست و نەستیم

(٧) ئەگەر بۆم دەست بدات داوێنی لوطفت
ئەوا من دوور لە داماوی و لە پەستیم

(٨) مەکە ئەمڕۆ سبەی بۆ کوشتنی من[٦]
من خۆم خوێنە خۆری خۆپەرستیم

(٩) **بە ئاواتی ژیانی پاش نەمانم[٧]**
**ئەمن کوژراوی دوستی ، دەستی دەستیم**

(١٠) **ئەهای چەن خۆشە مەستی عیشقی تۆبوون**
**غولامی گەردی قاپی عیشق و مەستیم**

(١) دڵ شۆرین ، مەبەست « تەزکی یەی قەلب » ە.
(٢) تۆ = لێرەدا مەبەست خودایە .
(٣) مەبەست تیشکی نوری خودایە کە لەدڵی صوفی‌یەکانا ئەدرەوشێتەوە .
(٤) دەس نیشانە بۆئەو ئایەتەی کەئەفەرمێ « إنا عرضنا الأمانة على السماوات والارض فأبين أن يحملنها واشفقن منها وحملها الانسان إنه كان ظلوماً جهولاً » احزاب (٧٢)

لای برێ ، ئەمانەت ، بریتی‌یە لەئیمان وە خوداپەرستی‌ی .
بەلام لای‌سۆفی‌یەکان ئەمانەت عیشقی‌خودا یەو خوداناسی‌ی راستەقینەی « عين اليقين » ە .

چون لەحەدیثێکی قودسی‌دا خودا ئەفەرمێ هیچ کوێ لە ئەرزو ئاسمانەکان شیاوی ئەوەنەبورجێگەی منی تیا بێتەوە ، بەلام دڵی بەندەی خاوەن باوەڕ جێگای منی تیانەبێتەوە .
هەروا فەرموویەتی ، « قلبُ المؤمنِ عرشُ الرحمان » . جا ، شیعری چوارەم ئەڵێ ئەمانەت کە گەوهەری عیشقە لەلامە چونکە من ئەمین‌داری ئەو ئەمانەتەو ئەوین داری ئەو عیشقە ئەلەستی‌یەم .
(٥) ئەلەستی‌ی دەس‌نیشانە بۆ ئایەتی (١٧٢) « اعراف » ، کە خودا لە رەوانی رۆڵەکانی ئادەم ئەپرسێ « ألستُ بربكم » ؟ هەموو ئەڵێن « بَلى » ، واتە ، بەڵێ تۆ خاوەنی ئێمەی ... ئەمیش ئەڵێ هەر لەورۆژەی ئەلەستەوە من ئەوین‌دارم واتە عاشقی نوری خودای گەورەم .
(٦) ئاواتە ، بۆئەوەی خود « نەفسی ئەممارە » ی بکوژێ ، یان بیکاتە « شەهیدی عیشق » ی خود ی
(٧) ژیانی پاش نەمان نەبێتە ، ـەقای پاش فەنا ، کە ئاواتی گەورەی رێبوارانی رێگەی عیشق و ت رێگەی تەصەووفە .

# ئەگەر ..!

جەلال مەدحەت خۆشناو
هەولێر ١٨/١٠/٩٨١

ئەگەر بێ بولبول بخوێنێ
چۆن گوڵی مەست ..
لەباوەشی چڵ ئەمێنێ
چۆن بەپڕ هەست ..
نابێتە لاوك و هەڵبەست !
ئەگەر بێ ، بولبول بناڵێ
چۆن ئەبێ نازی گوڵی گەش
سەودا نەباتە خەیاڵێ
بەپرتاو نەڕواتە باوەش !
ئەگەر بێ بولبول بنازێ
لەخەزانی حەزو ڕازێ

چۆن ئەبێ گوڵ ..
نەبێتە تاسەو خورپەی دڵ
نەڕوا بەدوای بانگەوازێ !
ئەگەر بولبول متووی گوڵ بێ
حەزی پڕ خورپەیی دڵ بێ
ئاواتی خونچەی سەرچڵ بێ
چۆن ئەبێ گوڵ
خوناوی دڵ
لەسەر پەلكی سوور بڕێژێ
خەندە لەسەر ڕوو بنێژێ !
حەز بخاتە لانكۆرەی خەم

بەنكی بولبول بباتە چەم
خۆشی فرێداتە ناو تەم !
ئەبێ .... نابێ
هەتا ژین و گیان مابێ
گەر شەو دابێ
دڵدار بكەونە سێ و دوو
كە ڕۆژی نوو
دێتەوە ناو باوەش ئاسۆ
ژوانی ماچێك ئەكەنە هۆ
خۆشەویستی سەر لەنوێ
لەبەینی دوو دڵ دەپشكوێ !!

# ژوان

● ئازاد دلزار ●

هەموو شتێ چاوەڕێتن
لەباغە ساكارەكەمان
گوڵە هێرۆ ،
واخۆی خستۆتە سەر پەنجە .
چاوەچاویەتی بۆ كۆڵان
گوڵەبەڕۆژە پشت لە هەتاو ،
ملی لارە ڕوەو دەرگا ،
لەگەڵ شنە
جارجار سەرەتاتكێیەتی ،
تاوتاو دەكەوێتە ڕامان .
باندی مۆسیقای چۆلەكە
بۆ پێشوازیت ،
هەڵیناگرێ بنكی هەنجیری گەلایان .
بەپەرۆشە ،
لەنێوانی پەنجەكانتا
سیس هەڵگەڕێ ڕەشە ڕەیحان .
لەژێر كەوشەكانتا بگوێ ،
چیمەنی بەر سێبەری خەستی ئێواران .
تێكڕای گوڵە - ڕازقیەكان - چاوەڕێتن .
هەردەركەوی .
تا بیكەنە ڕشێنە عەترو ، گوڵ باران .
وەك بڵێی نەیان بیستووە ،
دەبێ چی بكەن گەر بزانن .
بەسەرهاتی كۆرپەی خۆشەویستییەكەمان !
كەهەردوێنێ پێش خۆرنشین ،
كەوتە ژێر پێچكەی ماشێنی
ڕووگرژێكی بۆرژواكان .

# بانگێنا نەخوەش

ژ سالوٚخدانا دیارە ..
خویانی لدوورهیٚ سەکنین
ویٚفەتر ئەڤروٚ کەفخوێنە
بوومە پەڕیٚ پیڤازیٚ ،
بابەلیسکا دامە بەر خوە
نهینیڕیا بپەروا هەر تێنە !!
وەك ساڤاییٚ ژشیرڤەکری
بیٚری‌یا مەمکیٚ دیا خوە دکم
مینا کەسیٚ د خەریك چوٚیی
پیلیٚن دژوار سنگیٚ سوٚتی
لتەقەکیٚ باو باڕوٚڤەنە
نژدەڤان دیسا وەناکن
دەستو لەپیٚن بووکا سالیٚ
بسكو کولیێن کەفنارنجی
ببینن خەنا ..
لخەلکی مرادە لاو پیربن !؟
م مرادە ..
چزاڤزی نەئێنەکار
کورتوپست ئاشکەرابن
بەرکەل داکەڤنە سەماییٚ
لئەردیٚ خودیٚ ، نەیی‌زابن
م چاڤە راستی بێتە هلیٚبڕین ،
مراد نەبن ..
ڕازیٚن شعر تیٚ نخاڤتی
لبەر تی‌ییٚ ساهی‌ییٚ ڤەبن !!
پەیڤیٚن کران :
دوورهە : غوربەت
کەفخویٚ : بەردەڤك
نەیی‌زا : لسەر نەقلا میرزا و
برازا هاتی‌یە لیٚکدان .
نەیی بخوە نابووری‌یە .

---

**ئیسماعیل تاها شاهین**
**دهوٚك**

# گازندەك .. بو ڕوژێ

« هیڤی بەرواری »

ئەریٚ روژیٚ هەر ژ میٚژە
ئەوە ئەزل ڤیٚ جیهانیٚ
بویمە میٚهڤان
من گوهـ ل ناڤیٚ تە بی‌یە
خڕ دبیٚژن ..

زور جوان و ژیٚهاتی‌یە
هەلاتنا
ویٚ لسەر کیٚری و زنارا
هەمی تاڤ و ..
ڕوٚناهی‌یە
گرنژینا ویٚ ل خەلکیٚ
تەڤدا گوڤەندو تلیلی

نو شاهی‌یە
هانیٚ روژیٚ ..
هەمی‌دەما هەر گوهیٚت من
دڤەچنینە
بو هاتنا مزکینیا تە

جوت چاڤیٚن من نوبەدارن
بو دیتنا ..
ڕوناهیا تە
لیٚ روژیٚ هندی دویڤ تەڕا
دچەورم
تو خول من غەوارە دکەی
خو ددەیە پشت
بەتەن و چیاییٚت بلند
دا نەکەمیتە من تیٚهن و ..
گەرماتیا تە
بەلیٚ روژیٚ باش بزانە
تیٚ ژ تەڕا
ئەڤیندارم
گەر خەلك تە ماچی‌کەتن
ئەز هەر دیٚ وەکی دینیٚ خو
هیٚشتا پتر ..
پەریٚسم ویٚ ڕوناهیا تە
ڕوٚناهیا تە

# کوردم

**● ئەقدەسی مەریوانی ●**

ـەـتکو خوێن لە لەشمابێ ئەڵێم کوردم ، لەلای کوردم
ـەـوگیان دادەنێم بۆ کورد ، لەبۆ خوشك‌و برای کوردم
.ەکو بولبول لەباخانا ، وەکو پەروانە لای شەمدا
ـوتم قەت نیە باکم ، ئەڵێم نەغمە سەرای کوردم
ـنوشتی خەلقەتم کوردە ، بەکوردی گۆچ کراوم من
ـ وژێك هاتمە دونیاوە ، لەخاك‌و خانەزای کوردم
ـێشکەی کوردییا نامیان‌و ، بەسرا دەست‌و پێ‌و قاچم
ـەتا ئێستا لەپیریشدا ، گرفتاری بەلای کوردم
ـحەورو زوڵی بێگانە ، ئەمن قەت ناپسێ پشتم
.ەکو پاڵنگی پێکراوم ، لەناو شاخ‌و چیای کوردم
ـەهیوام ئەم برینەم ڕۆژگارێ بێت‌و سارێش بێ
ـەسەربەستی گەرم سەربەستی‌یە تەنیا دەوای کوردم

بەسەربەرزی لەخاکی نیشتمانا سەربەخۆییم بێ
بەدەستی خۆم کەوێ خاك‌و وەڵاتی خۆش هەوای کوردم
لەباخ‌و چیمەن‌و گوڵزارەکانا هەر بڵێم کوردم
بەشیعری پڕ لەشانازیم ، بڵێم ئازادیخوای کوردم
نەسیمی پڕ لەعەتری بەربەیانی شاخەکان بۆنکەم
کەمن شەیدا سیفەت ، مەجنونی ئاوو خاك‌و بای کوردم
لەبۆ ئاواتی دیرینم ، دەمێکە دڵ پڕوزاوم
بەهیوای هەڵەتی کوردم ، هەموو دەم چاوەڕای کوردم
کەدەستی یەکتری بگرن لەمەیدانی خەباتمانا
لەبۆ ڕاونانی دوژمنمان لەخاکی پڕ بەهای کوردم
نەوەك ئەو کوردە نامەردە ، دەبێتە پیاوی بێگانە
ئەوە جێگەی نیە هەرگیز لەژێر سایەو پەنای کوردم
کەوێتە پێش بێگانە ، لەبەرکا بەرگی نامەردی
لەبۆ دوژمن ببێتە باعێسی فەوت‌و فەنای کوردم
ئەوە کوردە لەگۆڕیشدا وەڵامی هەر بەکوردی بێ
بڵێت پرسینم هەر کوردە ، ئەمن عەبدی خودای کوردم
ئەوە کوردە وەکو تۆ « ئەقدەسی » شەیدای گەلی کوردە
شەوو ڕۆژ هەرئەڵێ کوردم ، غوڵام‌و گیانفیدای کوردم

---

# کوژاندنەوەی دوو مۆم لە تەمەنی بێ دەنگی

**● مظفر سەرکەفری ●**

ـیگلم لەڕێی زۆر جێ‌ژوانا بۆ ڕاخستووی
ـۆ زۆر دیدار .
ـنم خستۆتە سەر لەپم ..
کەچی تۆ جارێك نەهاتووی !
ـ ئێستاکە ڕێت‌نەداوە
ـلێوی شەقارو تینووم
ـێ بنێتە زەوی باڵات
ـ بزەت بکا بە ئاڵاو ..
ـوانت بکا بە وڵات
ـەی کیژۆڵە
ـیدەییك ، چەپکێ شادیت
ـەبەر پەنجەرەی چاوانما ،
ـەخستە ئێنجانەی بزە

ئەی کیژۆڵە کەی دێیتە ژوان ؟
ئەمشەو هەناسەم دو مۆمی
لە تەمەنی بێ‌دەنگی تۆکوژاندەوەو ..
نیگام لە چاوەڕوانی هاتنتا
شەو چاوانم دەخاتە ژان !
بۆ سڵ‌ئەکەیت ؟!
خۆئەگەر تۆ قامکەکانت ،
بخەیتە ئێنجانەی دەستم
ئەبن بە چەپکێ هەڵاڵە !
تۆ ئەگەر بێیت
هەنگاوت ئەبێ بە قەڵەم
ڕێگا ئەبێ بە دەفتەرو ..
شوێن پێکانت بەجووانترین هۆنراوە !



فاضل شەوڕۆ

دار هەناریّ
وەك خێڵێکی سەرهەڵگرتوو
لە کەناری رووبارێکا باروبارگەی
کۆچی ئەخا ،
مانگە شەویّ
شنەی بایێ
درزی سوخمەی شۆڕە رووبار ئەترازێنیّو مەمکی شیپی ی
شەپۆڵەکان بەدیار ئەخا دارهەناری سەر بە گەڵا .
وەك دێوانە شەیدا ئەکا .
لەو شەوەوە

دارهەناری شەنگ و عاشق
دەستو پەنجەی چڵی شۆڕی زێرینی خۆی
بەسەر پرچی زیوینی ئەم شەپۆڵانە دائەهێنیّو
بەسەر هاتی
پڕ لە خوێنی (هەزار مێردو حەسەن بەگ) یان
بۆ باس ئەکا
رووباریش وەك دەروێشێکی چاو نەترسا
لە تاو عیشقی دارهەنارو بەفرو چیا
گڕ لە بالای خۆی بەرئەدا .
پایز دادیّ ..
کزە بایێ

یەكدوو گەڵای زەرد هەڵگەڕاوی دارهەنار
ئەخاتە سەر سینگو مەمکی شۆڕە رووبار
رووبار تێر تێر ماچیان ئەکاو
توند توند لە ئامێزیان ئەگریّ
داستانی ئەسپەکەی (سمکۆ) و ئەفسانەی
شەڕی (دەربەند) یان
لەبن گوێیا ئەچرپێنیّ
تا بەیانی
لەگەڵ ووردە ماسیەکانا

لە باوەشی بەفراوی خۆی ئەیان نوێنیّ .
شەوی دادیّ
پێنچ شەش گەڵا :
گەڵای بیّ سەر ، گەڵای بیّ چاو
گەڵای بیّ رەنگ ، گەڵای خنکاو
ئەخاتە سەر دەمو چاوی شۆڕە رووباری نەنووستووارووبار
وەکو پاوانێکی گڕ تێبەربوو ڕائەپەڕیّو ئەڕوانێتە خەرمانەی
مانگ :

سکی خەزان کۆترێکی چاو بەخەمەکە سەر شانی دارهەناری
ست لە ئەژنۆ هەڵ نیشتووە .
ی وەرزی گەڵا ڕێزانی پار ئەکاندارهەناریش
یواش هێواش چڵەکانی دێنی و ئەبا
زیەوە فرمێسکەکان
و بەنچەی گەڵاکانا حەشار ئەدا .
وی سییەم :

ش ئەوەی مانگ چاو هەڵێنێ و « با »
شەقەی باڵی بدا
هموو چرووگەڵاکانی دارهەناری شێت و شەیدا خۆیان خستە
وە وەشی شۆڕە ڕووبار
و شەوە تاکو بەیانی
ووبار گریا ، بە دڵ بە کوڵ گریا
ووزەی گریانی بڕا ..
ەوسا فەرمووی :

- رهەنارە کلۆڵەکەم
ەی مەنزڵگای ڕێبواری شەکەت و تینووئـەی ئارامگـای منی
ڕیندارو ماندووبۆ ئەم گەڵا جوان جوانانەت
سەر باڵای منا باراند ؟
و منت کوشت ؟ بۆ خۆت سووتاند ؟
- رهەناریش تاوێ ڕاماو ئەوسا وتی :
ەی ڕووباری کوێستانی سەر بە تەم و خەم
خۆشم ئەوێی
ەی ڕووباری سەر هەڵگرتووی وڵاتی شەم
خۆشم ئەوێی
ئەزانم
تۆ بە هەر شوێنێک دابڕۆی

بەناو ڕەزو چۆم و باخا
بە ناو شارو گوندو شاخا
بە ناو دەشت و بیابانا
بە ناو گەرمیان و کوێستانا
باسی عیشقی خۆمان ئەکەی
بە خەیاڵی ماچی منا باڵی شەپۆلت لێك ئەدەی
کەچی گیانە ، لە وەتای هەین
ئەمدی مەردێ .. دەنگی .. ڕەنگێ
چاوی وشەی هیچ فەرهەنگێ
دان بە عیشقی ئێمە بنێ
داستانی پڕ خەون و خوێنی (دارهەنارو
شۆڕە ڕووبار ، بە جیهانا بناسێنێ
فەرموو گیانە ، شۆڕە ڕووبار
ئەوە هەموو گەڵاکانم ..
ئەوە خوێنم .. ئەوە گیانم ..
بەهەر شوێنێ تێ ئەپەڕی
سەر بە هەر شارێ دائەگری
دۆڵی هەر دەربەندێ ئەبڕی
بەبناری هەر گوندێکا ڕائەبوری
بەرەو خاکی هەر کیشوەرێ ئۆغر ئەکەی
لە دەرگای هەر ئۆقیانوس و ئاوێ ئەدەی
گەڵایەکی زەردی منی پێ ببەخشە
تابزانن کە درەختیش لەم وڵاتە
لە پێناوی عیشقی پاکا
عیشقی ئاوو عیشقی خاکا
گەڵاو خوێنی خۆی خەڵاتە .

کۆیە
١٩٨٤/٩/١١

# زەماوەندی کۆچەوبینە ..

« دووا شیعرم ، یاداشتی مردنمە »

فەرید زامدار

پاییزی / ١٩٧٩

لەگەڵ باران
لەرێی مەرگی هەرپارچە هەورێکی کۆچەر
باریمە چاوی هەواران
لەکوێستانان ..
بووم بە دێوانەی دەواران
بووم بە رەشەباو بەتەنیا

عیشقی هەموو ئەم زەمینەم دایە سەرشان
بووم بە زریانی بێداریو
رژامە ناخی شارەکان

بووم بە لافاوی رووبارە خەمبارەکانو لامدایە
هەورازە رێی چاوی رەشی ئەستێرەکان !..

بووم بە پێنووسێکی قەرەج
رەنگی وولاتی خۆمم هەڵگرت
لەهەندەران ..
زمانێکی نوێم بۆخۆم دارشت ..

بەلێوی خەم ..
بەزمانی شیعرێکی گەڕۆك
لەگەڵ رەوتی ..
ووشە غەریبەکان دووام
بەڕووانینی بێئاگایی چاسا‌وی ژیان
بۆتۆ گەڕام ..
بەدووای وونبوونی خۆم گەڕام
گەڕام بەدووای نزای مەرام .
بۆ هەزاران ..
پرسیاری ماندووی بێ وەڵام ؟..
کێ دڵی خۆی کردە خاكو
خۆڵی مەرگی ناردە ئاسمان ؟..

کێ ئازاری کردە هەوێن
بۆ شکانی ..
تێنوێتی زۆر برینو ژان ؟..

کێ برسیەتی بۆ خۆر ئاوای

ژینی ڕۆژێ خستە کۆڵو ..
ناڵەی نەهات بۆ پاروێ نان ؟..
کێ بوو (شەمی) لەکاروانی
شەوگاری دێوانە تۆران ؟...

هەزاران خواستو ئارەزوو
لەگۆمی کوێستانی ناخما
وەك زستانی شەختە مەیی
هەناسەی خەم ، لەسەختە ڕێی شاخی دڵما
هەنگاوی نا بە ئەسپایی ..
چەند داستانی دنیام خوێندو
چەند خۆم نووسی
تەنیا کاغەز لەئازاری ووشەم گەیی ..

وەك عیشقو .. وەك شیعر ژیام
وەکو دەوار نشینێکی ، شەیداو گەڕۆك
بەدووای خاكو نیشتمانێ
بەدووای ناسینی خۆم گەڕام
لەژێر پێی خاکی تەمەنما
کاریزی خۆشەویستیەکی شەرمەزارم لەڕوو تەقی
دڕکی شەرمو گریانی کپ
لەناو چاوی
ماندووی خەمەکانما چەقی ؟..
ووتیان فرمێسکی ئەو عیشقە
بارینی تاوانی حەزە لەگریانت
دەست هەڵگرە لەو برینەی
بەرین ترە لە ژیانت
دەست هەڵگرە لەڕۆژانێ
خەمی هێنا بۆ ڕووبەندی نێوچەوانت
دەست هەڵگرە لەو ئاواتەی ، چەندین ساڵە
بۆتە مۆمی شەوەکانت !..

ووتیان چی‌تر .. چیرۆکی هیوات مەنووسە
فەرهەنگی ڕاز .. مەخوێنەوە
ئەنجامت تا ئەو سنوورە
دووا لاپەڕەی چارەنووسە !..

بەڵام لای من .. هەموو ڕۆژێ
لەخاکی دڵما رووباری
دەتەقتەوەو
لەلاملی خۆزگەکانم .. دێتە خوارێ ..
زۆر ووشە هەن ... تاکو ئێستا .. نەووتراون
زۆر چیرۆکی دوورو درێژ هەن
جاروبارێ ، لەویژدانما ، سەرهەڵدەدەن
تاکو ئیستا نەنووسراون
هێشتا هەتاو چاوەڕێیە
گومان لەتیشکی خۆی دەکا
هێشتا ژیان .. ڕێبوارێکی بەبێ جێیە
قۆناغی زام بەدی ناکا
خەم لەعیشقو عیشق لەخەم یاخی نابێ
منیش هەنگاوم تەکانی ، سەفەری دوورترین ڕێیە
لەبێزاری منو شەودا
خەمی شەیدا .. کەوشی دێوانەی لەپێیە !..
خۆشەویستیم ، دارگوڵێکی .. بێ گەڵا بوو
لەکەناری غەریبی‌دا ..
لەخاکی خەم ... ڕەگی دەردا
لەسەر سینگی ئاوادەیی
زەمینێکی بێ نەخشەدا .. سەری هەڵدا

لەپێناوی کەسانی‌تر زۆر ژیامو
کەس لەپێناوی من نەژیا
بەچ زمانێ ... بتنووسمەوە ؟..
بەبسکی کام ووشەی کێوی ..

هۆنراوەی زاری کۆچەریت ...
بهۆنمەوە ؟..
لەجیهانی سەری گێژم ، ڈانابڕێی
وەك پەیامی پێغەمبەرێ
لەدووره شاز ..
بۆ وەحی ئاسمان بگەڕێ
لەخەڵوەت نشینی ناخما
ناچی‌یە دەرێ !..
تەنیا یاسای خەم‌و عیشقە
بتوانێ خۆشترین زمان
گەورەترین ووشەی ژیان
بهۆنێتەوە ..
وەك پەیامی پێغەمبەران
خەمت لەخەمی من نەچوو
شەپۆلی ویست‌و ئارەزووت
وەك شەپۆلی ویستەکانی من هەڵنەچوو
ئەوەی تیشك بوو لەتۆدا بۆمن نەبوو
سەرم خستە ژێر سووتانی ،.. ئاگرو هەتاو
چرای زمانت هەر هەڵنەبوو !..
لەڕۆژێکا کە نەمدەویست
ماڵئاوایی لەڕووت بکەم
نەهاتیەوە
چوویتە سەر شانی شەوان‌و
منیش بوومە تارماییت‌و
چوومە ناو تاریکیتەوە

کە خۆری جوانیت لەوێ
لەئاسمانی ماتیم هەڵات

خۆشەویستیم پێش سەرەتا
کۆتایی هات !..



چیرۆك بۆ منداڵان

# دار سێو

تایەر سالح / سلێمانی

بیری ئەم چیرۆکە لە فۆلکلۆرەوە وەرگیراوە .

باخەوانێك لە باخەکەی‌دا دار سێوێکی پێگەیاندبو . دارسێوەش لە بری ئەو ڕەنجەی خاوەنەکەی لەگەڵیدا دابووی ڕۆژی سێوە لاسوورەیەکی بۆ دەگرت . ئەو ڕۆژانەشی کە یەکێك لای بدایەتە ئەوباخە . دارسێوەکە دوو سێوی دەگرت . سێوێکیان بۆ باخەوانەکەی‌و سێوەکەی‌تریان بۆ ڕێبووارەکە . باخەوانەکەی خاوەنی ئەو باخ‌و دارسێوە کابرایەکی پیسکەو دەست نووقاوبو . ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کاتێك‌دا کە باخەوانەکە بە باخەکەیەوە خەریك‌بو . بەڕێکەوت پیرەمێردێك بە کۆمە کۆم هات‌و لای دایە لای باخەوانەکەو بۆ تاوێك لە ژێر سێبەری دار سێوەکەدا راکشاو خەوی لێکەوت .
لەو کاتەدا دارسێوەکە دوو سێوە لاسوورەی گرت . باخەوانەکەی خاوەنی دارسێوەکە ئەمەی بە هەڵزانی .

ـەنەسپاپی بۆئەوەی بیەڵێ پیرەمێردەکە خەبەری بیتەوە . بە ـ رسێوەکەدا هەڵگەڕاو سێوەکانی لێکردەوە . سێوێکیانی لەبن ـ رێکدا شاردەوەو ، سێوەکەی تریانی کە پیرەمێردەکە لە خەو مەستا هێناو کردی بە دووکەرتەوە . کەرتێکیانی بۆ ئەو داناو کەرتەکەی تریان خۆی خواردی . دارسێوەکەش وا سەری بە ـەریاندا شۆڕکردۆتەوەو سەیریان ئەکات . کە پیرەمێرەکە مندوێتی حەسایەوە . سوپاسی باخەوانەکەی کردو لێیدا ـڕیشت .

ـ رسێوەکە بەکردەوەی باخەوانەکە پەست بو . لە دڵی خۆیدا ـوتی :

● شەرتبێ ئەبێ تۆڵەی ئەوەت لێبکەمەوە . باخەوانەکە کە ـنی پیرەمێردەکە دوورکەوتووەتەوە . سێوەکەی ـبانیهانیو بە چەند قەپاڵێك خواردیو چووەوە بەلای ـخەکەیەوە . بۆ ڕۆژی دوایی باخەوانەکە هەر چاوەڕووانی ـرنو دارسێوەکە وەك ڕۆژانیتر سێوی بۆ نەگرت .

ـخەوانەکە سەری سووڕمابو . لەبەر خۆیەوە دەیووت :

● نازانم بۆ دارسێوەکەم ئەمڕۆ وەك ڕۆژان سێوم بۆ ـگرێت !؟.

ـ ر سێوەکە گوێی لە قسەکانی باخەوانەکە بو . دەمی لە گوێی نزیك کردەوەو پێی ووت :

● بیربکەرەوە ، دیارە هۆکەی دەزانی . باخەوانەکە ـیریکەوتەوە . پەشیمان بووەوە لەوەی لەگەڵ ئەو پیرەمێردە ـا کردبووی هەر لەوێداو لەسەر دەستیدار سێوەکەدا ـریاریدا جارێکیکە ناپاکی لەگەڵ کەسدانەکا . بۆ ڕۆژی ـوایی کە باخەوانەکە بۆ ناو باخەکەی دەچوو . بینی وا ـارسێوەکە دڵی چاك بووەو سێوە لاسوورەیەکی جووانی بۆ گرتووەو چاوەڕووانی دەکات بێتو بیداتێ .

ـاخەوانەکە ڕووەو لای دار سێوەکە چو . دار سێوەکەش ـەستی درێژ کردو سێوەکەی دایە .

ـاخەوانەکەش سوپاسی کردو سێوەکەی لێوەرگرت .

# ماسی یەکان

**غفور صالح عبدالله**

سێبەری چیا بەرزەکەی پشتەوەی بەردو درەختی لە ئامێز نابوو . ئەوناوە سرتەی لێوە نەدەهات .. ئاشەکە چەند ساڵێکە ئاسەواری نەماوە . تەنیا دوڵەنە لە بەردی خڕ و چیمەنتۆ دروستکراوەکەی نەبێت بەلاپاڵی ژوورسەری ئاسەوارەکەوە خۆی پێوە متکردوە . دیارە هەروەکو شوێنەوارێك هێشتبیانەوە . لە دامێنی چیاکەوە چەمو خڕە بەردێکە کە پاینی باخەکانە . بەرد لەسەر بەرد تەنگیان بەیەکتر هەڵچنیوە . وەکو مەڕو بەرخ بەسەریەکترا کەوتوون . لەسەرووی خڕەبەردەکەوە بە دوو سێ کیلۆمەتر هەر ڕەزو باخە بەمبەرو بەوبەرەوە ..

✱ مناڵەو هەرچێشتەنگاوێکی زوو لەتۆی دیژداشەیەك لەسەر بەرەخوارەی ئاوایەوە بەکشو ماتی خلدەبێتەوە . خۆی دەکاتە ناوجەرگەی ڕەزو باخەکانەوە . لەگەڵ ـ ماپۆمحە ـ ی ئاشەوانی پیرەمێرد لەسەر جۆگا ئاوەکە هەڵدەتروشکێ و یارمەتی دەدات بۆ ڕاماڵینی ئاردو لەدەفرکردنی . یاخود جەواڵو دەفری گەنم وەسەردەخا بۆ سەر کوپەی گەنمی پاراشەکە کە لەوێوە دەچێتە خوارەوە بۆ ناو کوونی بەرداشەکە بۆ هاڕین .. میزاوێك بە نێو خڕەبەردەکانەوە بەرەوخوار وەکو مارێك دادەکشێ . خرمەخرم دەخاتە بەردەکان ..

✱ فێری ئەوەشە لە هەر ربەیەك گەنمو جۆ چەند کەپوولە مزە دەگرێ .. لەپاینی میزاوەکەش گۆمێکی گەورە بۆ پەزو وڵاخ ئاودان هەڵبەستراوە . هەرکە جەستەی ئارداوی دەبێ ، دەچێ لەسەر جۆگاکەی سەرەوەی دوڵەنەکە جلو بەرگەکەی دادەکەنێ . دەیانشۆرێ و بەسەر لقوپۆپی درەختەکانەوە هەڵیاندەخان . کاتێکیش خۆرەکە دەکاتە ناوجەرگەی ئاسمان خۆی لە ئاوی گۆمەکە هەڵدەشەپێنێ . لافاوی زستانانیش بە

خڕەبەردو پوش‌وپەلاش گۆمەکە پڕدەکاتەوە . دەمەوبەهار کوڕو کاڵی گوند دەکەونە دەردان و جۆماڵکردنی .

تاوەکو جل‌و بەرگەکانی کزردەبنەوە لەناو گۆمەکە دەبێتە هاوڕێی ماسی‌یە ووردو قرژاڵەکان ..

قرژاڵێکی گەورە لە ئاوی جۆگا گەورەکەی بەردەمی کە لە دۆڵەنەی ئاشە ئاسەوار نەماوەکەوە دەهاتەخوارەوە راوە ماسی دەکرد . ماسی‌یە گەورەکان ماسی‌یە بچووکەکانیان لێ دووردەخستنەوە . خۆیان دەورەیان لە قرژاڵەکە دا . لەپڕێکدا ئاگای لێبوو قرژاڵەکە پەلاماری یەکێك لە ماسی‌یە گەورەکانی دا . قەپاڵی پێداکرد . لەناوقەدەوە ماسی‌یەکەی خستە دووتۆی شفرە تیژو رەقەکەیەوە . ماسی‌یە بەستەزمانەکەش بە پەلەقاژێ شڵپ‌وهۆڕی لەئاوەکە هەڵسان . ماسی‌یەکانی‌تریش لە ترسان رەوینەوە . ماسی‌یەکە لە پەل‌وپۆ کەوت . قرژاڵەکە وەکو هەستی کردبێ ماسی‌یەکەی لەگیان‌کردوە ، بەری‌دایەوە . دواجاریش بە لەنجەو لار دوورکەوتەوە .

ماسی‌یەکانی‌تریش هەرکە قرژاڵەکە لەچاو وون‌بوو . پەلاماری ماسی‌یە مردووەکەیان‌دا . زیوال زیوالیان کردەوە . تەزێك بەجەستەیدا فرکە فرکی دەکرد . دڵی هەڵدەشێوا . خەریك‌بوو بەرچاوی تاریك دەبوو . چیاکە لە خڕە بەردەکەوە تاوەکو ترۆپك پتر لە هەزار و پێنج صەد پێ دەبێ ..

* زۆرجاریش بۆ ئاوایی ناگەڕێتەوە بۆ نیوە رۆژەکردن . ساجەکەی ئاشەکە پاك‌و تەمیز دەشۆرێ . ئەنجاش چیلکەو چەواڵ و گەڵای ووشەکەوەبووی ژێر درەختەکان کۆدەکاتەوە . بەقاو چەخماخەکەی هاپۆ محە گڕ ئاگرێك خۆش‌دەکا . دەچێ قەرەوانەیەك ئارد لەبەردەم ئاشەکە هەڵدەگۆزێ . جوان جوان دەیشێلێ و سەری دەنێتەوە ..

لە سێ چارەکەی چیاکە کلۆرێکی گەورە بەسنگی‌یەوە دەمی دابچڕاندوە . چەشنی زاری زەلامێك بۆ هاوارکردن دایبچڕاندبێ . سەرگەڕێك بە هاوینان دەیکاتە هێلانە و هەوار ..

* ئەنجاش نۆرە دەهاتە سەر هاپۆ محە بۆ ئەوەی ساجە شۆراوەکە لەسەر ئاگرەکە لەسەر سێ کوچکە دەمەونخوون دانێ . گونك ببڕێ و گردە دروست‌کات ..

سەرگەڕەکە هێشتاکە لە هێلانەکەیەوە ملەقوتێ‌یەتی . بە دەوری خۆی‌دا چاو گڕدەدا . باڵەکانی شۆڕکردوتەوە . دیاربوو بای باڵەکانی خۆش‌دەکرد بۆهەڵفڕین و دەست بەراوی رۆژانەی خۆی بکات ..

* هەرکە زگیان تێردەبێ چەند چایەکی کەتیرە رەشەکەی بەسەردا دەکەن . هاپۆ محەش کیسە تووتنەکەی لە پشتوێنی دەردێنێ . جگەرەیەك بە فەلەمەکەی دەپێچێتەوە . پێ‌ی‌دەکا . مژی گەورە گەورەی لێدەدا . دواجاریش هەناسەیەکی قووڵ و سارد هەڵدەکێشێ . هێز دەداتە خۆی . هەڵدەسێ و دەچێ لە تەورەکە هەڵواسراوەکەی گێژنەی دەرگا شەق‌و شڕکە شمشاڵەکەی دەردێنێ . خەم‌و پەژارەی خۆی فوودەکاتە شمشاڵەکەوە ..

رچە رێیەکانی قەدپاڵی چیاکە لەدوورەوە کرمن و قەپاڵیان لەیەکتر گیرکردوە بۆ لەناوبردنی یەکتری . ئەو رچەرێیانەش شوێن‌پێ و سمی پەزو ماڵات رچەیانی کێشابوون . ئیتر ئەگەر بەچیاکەدا سەرکەوتبای ئەوەندە بە هەڵزنانەوە ماندوو نەدەبووی ..

دوو سێ مەتر ترۆپکی چیاکە قووتە . لەدوورەوە زەبەلاحێکەو کلاوقووتێکی لەسەرناوە . لە خۆڵە سوورەیەکی پەستاو پێك‌هاتوە . زۆرجاریش رەوە کەوێك لەو سەر ترۆپکەوە سنگ دەردەپەڕێنن و مل قووت‌دەکەنەوە و دەیکەنە قاسپەقاسپ .

* دارو بەرد و مارو مێرو بەئاوازە خۆشەکەی شمشاڵەکەی هاپۆ محە کپ‌و بێدەنگ دەبن . گوێ لە نووزەی ئازارەکانی

دەگرن . ئەمیش هەردوو دەستی لەدەور ئەژنۆکانی تێکگیر دەکا . چەناگەی دەخاتە نێوانیانەوە . چاو دەبڕێتە پەنجەکانی کە چۆن لەسەر کوونە ووردەکانی شمشاڵەکە بەدەم ئازارەوە سەمادەکەن . ئاوازی دڵتەزێن دەردەپەڕێنن . هەندێ جاریش چاوی دەبڕێتە چاوەکانی فرمێسکیان تێدا قەتیس دەبێ ..

سێبەری چیاکە دوو سێ شەقاو بەرەوژوور هەڵکشاوە . ماسی یەکان لەبەر تیشکی خۆرەکە کەوتوونەتە بریسك و باسك . وەکو جاخی جاران بەرەو شوێن ئاوپەڕی ئاشەکە یەکتری راودەنێن . بەلام لەوێوە قەڵبەزەی ئاوی دۆڵەنەکە سەریان ۆدەشێوێنێ . بەکزی و کلکە لەقێەوە سەر بەرەوخوار دەبنەوە .

ئەو سەروەختەی ئاشەکە ئاسەواری هەبوو . ئاوی دەمپۆزەی نۆڵەنەکە گۆمێکی گەورەی لەژێر ئاوپەڕەکە هەڵکەندبوو . ماسی یەکان بەئاسوودەییەوە لەوێڕا گەرایان دادەنا . یاخود لەژێر کەتەبەرد و تاوێرەکان هێلانەیان دەکرد و کۆزیان دەکرد .. کزەیەکی تەزیو بەهەناویدا داکشا . جگەرەیەك پاکەتی دەرهێنا ، وەکو جارانی هاپۆ محە مژی گەورە گەورەی لێدەدا ..

* هاپۆ محە لەرچەڵەکدا خەڵکی گوندەکەی ئەمان نی یە . باپیرەی بۆی گێڕابۆوە کە سالانێکی دووردودرێژ. ئەوساکە لاو دەبێ لەگەڵ ـ ئاتە ـ ی ژنی بەبارێکی شڕەو پڕەی سەر گوێدرێژێکەوە پەنا دەهێننە ئەم گوندە . تا ئێستاش هۆی هاتنی وگیرسانەوەیان لەم گوندە نهێنیە . خۆشی هەرگیز گرێی دڵی بۆ کەس نەدەکردەوە ـ ئاتە ـ ی خێزانی لە سەرەمەرگ بانگی کرد وپێی ووت کە گرێی دڵی خۆی هەتا هەتایە بۆ کەس نەکاتەوە ..
جریوە جریوی پاساری یان قریشکەی تیتروا سکێك دایدەچەڵەکێنێ . یان ووزە ووزی گەلای درەختەکان بەدەم باوەزەوە مارشێکەو تەرمی سەرجەمی مرۆڤایەتی بەرێدەخەن . تەنانەت لەدوورەوە دەنگ و هاواری

رەزەوانێکیش بەرگوێ ناکەوێ . دەڕوانێتە ماسی یەکان . چاو لە دوویان دەگێڕێ . هەستی کرد ماسی یەکانی جارانن کە وەختی خۆی دوو سێ یەکیانی لێ نیشان کردبوون . ئێستاکە بەرچاوی دەکەون .

* لەم چەمو خڕەبەردە هەراو قاوقیژە . هەچە هەچەی کاروانچی و باراش هاڕە . دەچێتە پیریی باراش هاڕەکانەوە . لەیەکێك باراش هاڕەکان دەپاڕێتەوە بۆنەوەی سواری گوێدرێژەکەی ببێ و لەم چەمو خڕەدا بکەوێتە لۆقەغار و وەکو شۆڕسوارێك خۆی بەسەریەوە قیت کاتەوە .
هاپۆ محە لە « نازیف » ی کیژە تاقانەی بەولاوە کەسی تری نییە . کیژێکی هەندێ بەژن زراف . سوورو سپی . جەستە خڕپنە . شەوو رۆژیش لەگەڵ باوکە پیرەکەی لە ئاشەکە بەسەر دەبا . کەم دەچێتە ناو ئاوایی . ئاوڕ لە هیچ لاوێکی گوند ناداتەوە . ئەوەندەش لەگەڵ خەڵکی گوند بەنێرو مێیەوە قسان ناکات .. زۆرجار بانگی ـ نازیف ـ دەکا بۆنەوەی لە پشتی خۆی سواری کات . بەدەم پێکەنینەوە گوێدرێژەکە تاودەن . و هەست بەگەرمو گووڕی رانەکانی بکات کە لە پشتی توندی دەکردن ..

خۆرەکە لە ترۆپکی چیاکەوە دوو گەزێك بەرزبۆتەوە . خارشتی گەرما دەخاتە جەستەیەوە . ماسی یەکانیش بەرەو سێبەری دارتوەکەی سەرگوێی جۆگاکە خۆیان دەکوتن . ئەنجاش لەوێ کۆزدەکەن . زۆربەیان لمۆز لەگوێی جۆگاکە بۆ مڵ و مۆش کردن دەچەقێنن . هەرکە ئاوڕی پشتەوەی دایەوە . کلۆری نێو سنگی چیاکە رووناك بۆتەوە . سەرگەڕەکە لە هێلانەکەی دیار نەماوە . سێبەرەکە گەیشتۆتە ناوقەدی چیاکە . بەجارێ تەنگەبەریەکانی ئەو دەوروبەرە رووناك بۆتەوە ..

**• نازیف ، تەنیا ئەمی ئاشنایە . ئەگەرچی بەتەمەنیش هەشت نۆ ساڵ لەم گەورەترە . هەروەکو منالێك لەگەڵیدا بەم رۆژگارە گەمەدەکات . چەمو رەزەکان دەتاکێننەوە و**

میوە دەكەنەوە دەدرن و دەیهێنن و لەناو ئاوە ساردەكەی كانیاوی ژوور ئاشەكەوە رووی دەكەن و خۆیان لێ ی مردەكەن . هەچ رۆژێكیش ئاشەكە باراشی نابێ ئاوبڕ دەكرێ . پێكەوە ئەم خۆی رووت دەكاتەوە . ئەویش خۆی لێ هەڵدەكا . لە ژێر ئاوپەڕەكە دەكەونە ماسی گرتن . بەدەم لاقرتێ و بەیەكتر ئاو پرژاندنەوە قەرەوانەیەك پڕ دەكەن لە ماسی ووردو درشت ..

سێبەری دالاشێكی گەورە بەسەر خرە بەردەكەوە سكەخشەی دەكرد . سەری هەڵبڕی . سەرگەڕەكە سوورو گوڕی ئەوناوەی دەدا . هەروەكو بۆنی كەلاكی تۆپیوی كردبێ . پاساریەكان بە باڵەفرێ دەوریەیاندا . هەروەكو گاڵتەی پێ بكەن پێدا هەڵدەگژان . ئەویش بەكوژمێكی شاباڵەكانی لە خۆی دووریانی دەخستەوە . دواجاریش بەرقەوە خۆی لاكردەوە . باڵەكانی خێرا خێرا دەدا یەكەوە . بەرەو ترۆپكی چیاكە هەڵكشا . پاساریەكانیش بە هەمان پاسا دووی دەكەوتن . ناچاریان كرد لە هێلانەكەی نەنشێتەوە . لەسەر ترۆپكی چیاكە نیشتەوە . رەوە پاساریەكان لە هێلانەكەی نیشتنەوە .. لەوەتەی لەوێیە بزەیەك بە دەروونیدا نەهاتبوو . بەو زۆرانبازیە كەوتە پێكەنین . سەرگەڕەكە دیاربوو جێگای بەخۆی نەدەگرت . دایە شەقەی باڵ و هەڵفڕی و لەچاو وون بوو .

* زۆرجار هەستی دەكرد « نازیف » بەدیدەی پڕ تامەزرۆییەوە تەماشای جەستە رووتەكەی ئەمی دەكرد . رەنگی سوورهەڵدەگەڕا . دەستێكی بەجەستە رووتەكەیدا دەهێنا . وەكو بڵێی دەیویست خۆی رووتكاتەوە و بە جەستە رووتەكەی ئەمەوە خۆی بنووسێنێ . ئەنجاش ئاگرێكی خۆش دەكەنەوە و هەردووكیان لەگەڵ هاپۆ محە دەكەونە ماسی برژاندن ..
هەستی كرد چرە دووكەڵ و بۆن و بەرامەی ماسی برژاو كونە لووتەكانی پڕدەكەن ؛ و قریوەی پێكەنینی « نازیف » دێتەگوێی . دەنگی پڕ جۆشی شمشاڵەكەی هاپۆ محە درەختەكانیان خستۆتە سەما ..

لەپڕ هەستایە سەرپێ . تەماشایەكی ماسیەكانی كرد . هەندێكیان سەر بەرەوخوار و سەربەرەوژووە راوە راویان بوو .. چیاكەش تەنیا هێلانە سەرگەڕەكە تۆپەڵێك سێبەری پێوە مابوو . هەندێ پاساری لەتاو گەرما خۆیان دابوە پەنای .. بەسەر بەرەوخوارەی ئاواییەوە سەركەوت .

خۆی كردە ناو گوندە بێ ئاوەدانیەكەیانەوە . چووە حەوشەكەی خۆیان چەند ساڵێكە بەجێی هێشتوە . داروباری هەروەكو خۆی ماوەتەوە . هێشتاكە سەكۆ تایبەتیەكەی باپیرەی وەكو خۆی ماوەتەوە . جگە هەندێ لێوارەكانی نەبێ رووخاون . خۆی كردە ئەو ژوورەی « ٣٠ » ساڵ بەر لە ئێستا لێ ی لەدایك ببوو . لەسەر زەویەكەی لە ناوەڕاستەوە پاڵی لێدایەوە و نۆخژنێكی هەڵكێشا ..

● ● ●

**هەولێر/ ئەكتۆبەری ١٩٨٥**

**پەراوێز**

١ ـ پایین : دامێن . كۆتایی
٢ ـ میزاو : ئاوێكی كەم
٣ ـ سم : پێی پەز . الظلف
٤ ـ پەز : مەڕو بزن
٥ ـ كەپوولە : دەفرێكە مزەی ئاشی پێ دەگیرێ
٦ ـ مزە : باجی باراش هاڕین
٧ ـ قەرەوانە : دەفرێكی گەورەیە ، دەوری .
٨ ـ گردە : جۆرە نانێكە لە ئاسیاو دروستی دەكەن .
٩ ـ فەلەمە : ئامێرێكی بچووكە بۆ جگەرەپێچانەوە .
١٠ ـ دەمپۆزە : بۆرییەكی دوو بست دەبێ لەدار دروستی دەكرێ و پانایەكەی ١٠ ئینج دەبێ ، لە پایینی دۆڵەنەی ئاشەكەوە بۆئەوەی ئاوەكە بەتووندی .. وێ بۆ سەر تۆپی بەرداش سووڕێنەكە دەیبەستن ..
١١ ـ كەتەبەرد : تاشەبەردی بچووك بەرێك و پێكی دەتاشرێ
١٢ ـ ئاوپەڕ : ئەو شوێنەیە كە لە ژێر بەرداشەكەوە ئاوفڕێ دەدا .
١٣ ـ كۆزیان دەكرد : سەردەنێنەیەكەوە . كۆڕدەبەستن .
١٤ ـ باراش هاڕ : ئەو كەسەیە كەنم و جۆ دەبا بۆ هاڕین لەئاسیاو ..

نووسینی : جەنگیز ئایتماتوف
وەرگێڕانی : بەدران احمد

# دایکە شووری شاخدار

ئەمە لەسەر دەمێکی کۆندا ڕوویداو . ڕۆژگاری زوو ، ـەو دەمەی سەرزەمین دارستانی پتربوو لە گژوگیا وڵاتی مەـ ـەوی زێتربوو لەوشکایی . هـۆزێکی قەرەغیـزی لە کەنـار ـووبارێکی گەورەو سازگار دەژیان . ئەو ڕووبارە پێی دەگوترا « ئینیسـای » ، لە شوێنێکی دوورە دەست ، لە سیبیـریـاوە ـەڵدەقوڵا لێرەوە بۆ ئەوێ بە سـواری ئەسپ سێ سـاڵو سێ ـمنگی پێدەوێ ، ئێستا ئەو ڕووبارە « ینیسی » نـاوە . بەڵام ـەنگینێ پێی دەگـوتـرا « ئینیسـای » . بـۆیێ ئـەو کـاتـە گۆرانی‌یەك هەبوو دەیگۆ :

**ئینیسای ، ڕووبار هەیە لەتۆ فراوانتربێ**
**ئینیسای ، خاك هەیە لەتۆ دڵگیرتربێ**
**ئینیسای ، کارەسات هەیە لەتۆ قوڵتربێ**
**ئینیسای ، خواست هەیە لە خواستی تۆ بەرزتربێ**
**ـووبار نییە لە تۆ فراوانتر بێ ئینیسای**
**خاك نییە لە تۆ دڵگیرتر بێ ئینیسای**
**کارەساتی نییە لەتۆ قوڵتربێ ، ئینیسای**
**خواست نییە لەخواستی تۆ باڵاتربێ ئینسای**

ئینیسای ئاوهابوو . زۆر نەتەوەی جیاجیا لە کەنار ئەو ـووبـارە دەژیان . سـەبارەت بـە نـاکـۆکیو نـاتـەبـایی بێ ـرانەوەیان ژیانیان دژواربوو . دوژمن لە گـەلێك لاوە هـۆزی قەرەغیزییان . دەوردابوو . جارێك ئەمو جارێك ئەو بەسەریان ـدەدان . کـەرگێزی خـۆشیان پـەلاماری خـەڵکیان دەدا . ـیاویان دەکوشتن ماڵیان دەسوتاندن ، تاڵانو بڕۆیان دەکردن . ـەرچی بەردەستیان کەوتبا دەیانکوشت . ئەمە حاڵو حسێبی ـەو زەمانەبوو . مرۆ بەزەی بـەمرۆ نـەدەهات . مـرۆ مرۆی ـەکوشت . کار بەرادەیێ گەیی کەس نەما دەغڵودان بچێنێو ـەروماڵات پەروەردەبکاو بهێنێـە ڕاوێ . ژیانی بـە تاڵانکـاری گەلەك هاوسـانتربـوو . دێودەکوژێو تـاڵان دەکا . نـرخی کـوشتن بـە خـوێن دەدراوەو تـۆڵە بـە تـۆڵەی گـەورەتـر دەساندراوە . خوێن ڕشتن ڕۆژ بە ڕۆژ زێتر دەبوو . هۆش لە مێشکی مرۆدا نەمابوو . کەس نەبوو ناوبژی دوژمنان بکـا . ژیرترینو چاترین کەس ئەوەبوو هێرشی توندو لە ناکاو بکاتە سەر دوژمنو گەورەو بچوکیان بکوژێو مەڕو ماڵو کلوریـان تاڵان بکات .

لە دارستانەکە باڵندەیەکی سەیر پەیدابوو بوو ، شەوان تابەیان بە دەنگێکی مرۆیانەی سەیر دەیچریکاندو ، لەم چڵ بۆ ئەوچڵ دەفڕیو ئاهونالینی دەکرد ، دەیگوت : « کارەساتێکی گەوە دەقەومێ کـارەساتێکی گـەورە دەقەومێ » . ئـەوەبوو قەوما ئەو ڕۆژە تۆقێنەرە هات .

ئەوێ ڕۆژێ هۆزی قەرەغیزی کەنارنشین ، سەرداری کـۆچکردویـان دەناشت . کـولتشـە سـاڵانێکی دوورو درێـژ سەرداری هۆزبوو ، هاوبەشی لە زۆر تاڵانو بڕۆیان کـردو لە گەلەك شەڕاندا بریندارکرا بەڵام لەمەیدانی جـەنگ نـەمرد کاتو ساتی مەرگی هات . هاوتیرەکانی دوو ڕۆژیان لە شەوبۆ شینو گریان بەسەربرد . سەری سێیەمین کۆبوونەوە بەخاکی بسپێرن . بە پێی رێو رەسمی بابو باپیران ، دەبوایە تەرمی سەرداری هۆز دەمو دەم کەنار ، بەنێو دۆڵو نشێوان بۆدوایین ئارامگای هەڵگیرابا . تاوەکو گیانی کۆچکردوو لە بڵندایی‌یەوە ماڵئاوایی لە ئینیسای دایك کـردبا . « ئینی » یـانێ دایكو ، « سای » واتە ئاوەڕۆیان ڕووبـار . بۆ ئـەوەی گیانی ئـەو بۆ دواجار گۆرانی ئینیسای بچڕێ :

**ئینیسای ، ڕووبار هەیە لەتۆ فراوانتربێ ؟**
**ئینیسای ، خاك هەیە لەتۆ دڵگیرتربێ ؟**
**ئینیسای ، کارەسات هەیە لە تۆ قوڵتربێ ؟**
**ئینیسای ، خواست هەیە لە خواستی تۆ باڵاتربێ ؟**
**ڕووبار نییە لەتۆ فراوانتربێ ، ئینیسای .**
**خاك نییە لە تۆ دڵگیربێ ، ئینیسای .**
**کارەسات نییە لە تۆ قوڵتربێ ، ئینیسای .**

خواست نییە لە خواستی تۆ بالاتربێ ، ئینیسای .

دەبوایە لەسەر گردی ناشتن . لە تەنیشت گۆڕەکەی ، سەردار هۆزیان لەسەر سەران ڕاگرتبا بۆ ئەوەی لە هەرچوارلاوە خەڵك ببینن . « ئەوە ڕووبارو ، ئەوە ئاسمان‌و ئەمەش خاکی تۆیە ، ئەوەش ئێمەین ، هاو ڕەگەزی تۆین ، هاتوین بۆ دواین‌جار بەڕێت بکەین‌و ماڵئاوابێت لێ‌بکەین وەتۆش بە ئارامی لێی ڕاکشێ کێڵە بەردێکیان لەسەر گۆڕەکەی دەچەقاند تابێ بە یادگار بۆ نەوەکانی داهاتوو .

ڕۆژانی ماتەمی‌و تەرم ناشتن ، دەم‌و دەم کەنار هۆزی قەرەغیزی ڕەشماڵیان یەك یەك لە تەنیشت یەك هەڵدەدا . تاهەر ماڵەی لەبەر کۆسپەی خۆی تەرمی سەردار هۆز بەڕێ‌بکا کاتێك تەرم هەڵدەگیرا . هەرماڵێك ئالای سپیی پرسە هەڵبداو بداتە شین‌و گریان‌و دوای تەرم بکەوێ لەگەڵ ئەوانی‌تر بەرەو ڕەشماڵێکی‌تر ، کە ئەوانیش دەیاندا شین‌و گریان‌و ئالای پرسەیان هەڵدەدا تا بەکۆتایی ڕێی‌و گردی ناشتن دەگەیشتن .

ئەو بەیانییە ڕۆژ گەیشتە تاقی ئاسمان ، هەموو ئەسپابێك کۆك‌و تەیارکرا گۆچان بەرزکرانەوەو لە سەروو ئەویشەوە کلکی هێستر لەسەر ڕم هەڵدرا . چەك‌و کەرەستەی شەڕی سەردار هۆز ـ لە شیرو مەتاڵ بەرزکرانەوەو ئەسپەکەی بە پۆشاکی شەڕ داپۆشرا زوڕناژەن ئامادەبوون ئاوازی شەڕ بژەنن‌و دەهۆڵ کوت ڕمبە لە دەهۆڵ هەستێنن . تاکو هەموو لایەکی جەنگەڵی « تایگا » بهەژێ . پەڕەوڵ بفڕن‌و وەك گەواڵە هەور ئاسمان بتەنن‌و بە ئاهوناڵینەوە خول بخۆن تاکو درندەو کێوی بە فیشکەو نەڕەنەر بدەنە بێشەلان‌و جەنگەڵستان‌و ، تاکو چلەگیا لەسەر زەوی سەری دابنەوێ‌و کڕنووش ببا تاکو کەژو کێو لە شوێنی خۆیان بترازێن .

ژنان دەگریان‌و پرچیان دەڕناندەوە ، فرمێسکی گەرمیان بۆ سەرۆك کۆلتشە هەڵدەوەراند . "جیغیتی"* لەسەریەك ئەژنۆ ڕۆدەنیشتن‌و لەتەرمی کۆچکردوو دەنەوین‌و دەیانهاوێشتە سەرشانی بەهێزیان . خەڵك هەموو ئامادەبوون‌و چاوەڕانی تەرمی سەردار هۆزبوون ، لەلایەکی دارستانەکەشەوە قوربانی ڕاگیرابوون : نۆ ئەسپ‌و نۆگامیش‌و نۆ نۆیی لە کاوڕە دابەستی بۆ پایەداری جوانەمەرگ دەکوژرانەوە .

لێرەوە لەناکاو ڕووداێکی کتوپڕ هاتە پێشەوە ، کەکەس چاوەڕێی نەکردبوو . هەرچەند ڕکابەری نێوان خەڵکی ئینیسای تاوی ساندبا ، باونەبوو ، کاتی ناشتنی سەردار هۆز کەس بەسەر دراو سێدابدا . ئێستاش وا دوژمن بە پێدزکە هاتوون‌و لەگەڵ گەردی بەیانیان لە هەمولایەکەوە گەمارۆی دابوون . لەکاتێکدا کە ئەوان بە پەژارەو ماتەمی‌یەوە وەستابوون . قەرەغیزی لە هەمولایەکەوە دەرپەڕین ، کەس دەرفەتی وەی نەبوو خۆی باوێتە سەرزین‌و دەس بداتە چەك . کوشتارێکی بێ وێنە ڕویدا هەموو لەسەریەك کوژران . ئەمە داوو دەهۆیەك‌بوو دوژمن بۆی نابوونەوە تاکو هۆزی قەرەغیزی بەدەست لێوەشاندنێك پاکتاو بکەن ، ئاسەواریان لێ ببڕنەوە تاکەس نەبێ ئەو کوشتارەی لە بیر بمێنێ‌و تۆڵەی وەربگرێتەوە . بۆئەوەی ڕۆژگاربەنوکی ڕمب شوێنەواری کۆن بسڕێتەوە ، ئەمەش هەروابوو .

لە دایك بوونی مرۆو پەروەردە بوونی کاتی زۆر دەوێ بەلام بەچاوتروکاندنێك لە ناو دەبرێ . زۆرکەس ئەنگاوتران‌و لە گۆمی خوێن گەوزین . زۆری‌تر لە ترسی شیروتیر خۆیان بە ئاوێ داداو لە نێو شەپۆلی ئینیسای نقوم بوون ڕەشماڵی قەرەغیزی پاش ئەوەی ئاگریان بەردرابوونی ، بە درێژایی ڕووبارو بەلاپاڵی گردو هەڵدیران گریان سەند . کەس دەرفەتی هەلاتنی چنگ نەکەوت . زیرووحیان لێ‌نەما هەموو شتێك خاپووروو وێران کران‌و سوتێنران . لاشەی کوژراویان بە چۆمی ئینیسای داوا . دوژمن هەلهەلەی شادمانیان هەڵدا : « ئێستا ئەو خاکە بووە هی ئێمە ئێستا ئەو لێرەوارانە بوونە هی ئێمە ، ئێستا ئەومێگەلانە بوونە هی ئێمە » .

دوو مندال ـ کوڕو کچێك ـ دوو مندالی بزۆزی چەتوون ، لە سبەینی‌وە بەدزی دایك‌و باوکیان لە مال دەرچووبوون بۆجەنگەڵە نزیکەکە . تا چڵە زەیزەفۆن ببڕن‌و سەبەتەی لێ دروست بکەن بەگەمە خافلابوون‌و ئاگایان لە خۆ بڕابوو کەوتبوونە ناوەندی چڕەبێشە لانەکە کاتێك هەراو زەتای کوشتاریان هاتە گوێ بە پڕتاو بەرەومال گەڕانەوە . کەسیان بە زیندوویی نەدیت نەدایك نەباوك نە خوشك نەبرا ، دوومندال بێ

مالو بێکەسوکار مانەوە دەگریانو لە ئاگرو پەردوو بۆ ئاگرو پەردوو ڕایان دەکرد . زیندەواریان لێنەمابوو لەماوەی تاکە سەعاتێکدا بێ نەوا بوون . لە دوورەوە هەورو شریتەی تۆز بەدی دەکرا . دوژمن مەروماڵاتو ئەسپو گاڕانیان بەپێش دابوونو هەڵیان دەپێچان کە لە تاڵانکارییە خوێناوییەکەیاندا دەچەنگیان هێنابوون .

دوو منداڵەکە تۆزی پێی ئەسپانیان بەدیکردو هەڵیان کردەغار . دەگریانو هەنسکیان دەدا . تەنیا منداڵ بەو ڕەنگە ڕەفتار دەکەن . لە جیاتی ئەوەی خۆیان لە چاوی دوژمن وەشێرن ، بەدوویان کەتبوون بۆ ئەوەی بەتەنێ نەمێننەوە . بۆ ئەوەی لەو شوێنە وێرانو شوومە دوور کەونەوە . کوڕو کچەکە دەستی یەکتریان گرتبوو و بەدوای دوژمن کەوتبوون دەپارانەوە بەجێیان نەهێڵنو لەگەڵ خۆیان بیانبەن .

کچو کوڕەکە بێهودە غاریان دەدا . بە دوژمن ڕانەدەگەیشتن ، لە ماندوێتی خۆیان لەسەر زەویکەوتنو نەدەوێران سەیری دەوروبەریان بکەن . دەترسان لە شوێنی خۆیان ببزوون لەبارێکی تەنگو ئاڵۆزدا دەژیان یەکتریان گرتە باوەشو خەو بردیانیەوە .

هەروا بەخۆڕایی نەیان گوتوە هێتیم حەوت ڕوحە ئەویان بە هێمنی بەسەر بردوو لە دارستانەکە دڕندەو کێوی توخنیان نەکەوتن . کە لە خەو ڕابوون بەیانیبوو ، چێشتەنگاو دەرەوشاوە ، چۆلەکە دەیان جریواند . ڕابوونو بەشوێن دوژمنان کەوتن . لەڕێی میوەی دێمییان کۆکردەوە . ڕۆیشتن ، ڕۆیشتن . دوو ڕۆژان ڕۆیشتن ، سەری سێیەمی لەسەر چیایەکی بڵند وەستان . سەرنجیاندا . لە خوارەوە ، لە بن چیا ، لە مێرگێکی سەوزدا هەرایەکە ئاهەنگو بەزمێکە چ ڕەشماڵێك هەڵدرابوو ، چ ئاگرێك کرابۆوە . بێ ئەژمار . ئەو ئاگرانە خەڵکی زۆریان لە دەور ئاڵابوون . لە ژمارە نەدەهاتن کچان لەناو جۆلانە دە هەژانەوەو باڵۆرەیان دەگوت . زۆرانباز خەڵکیان وەپێکەنین دێنا . وەك باز لەیەك دەوروکانو سواری ملی یەك دەبوونو پشتی یەکتریان لە عارد دەداو لە خۆڵیان دەگەوزاند ئەمانە دوژمن بوون ئاهەنگی سەرکەوتنیان دەگێرا .

کچەو کوڕە لەسەر ترۆپکە چیایەکە وەستابوون بێئەوەی زات بکەن بچنە پێش . بەڵام تەواو حەزیان دەکرد لەبەر ئاگر بوەستن بۆنو بەرامەی گۆشتی برژاو ئاوی لەزار دەهێنان .

دوو منداڵەکە نەیانتوانی زیاتر خۆبگرنو ووردە ووردە لە چیاکان هاتنە خوار ، بەزمگێڕەکان لەهاتنی منداڵەکان سەریان سوڕماو ، دەوریان لێدان :

- ئێوە کێن ؟ لە کوێوە هاتوون ؟

کوڕو کچەکە وەڵامیان دانەوە :

- برسیمانە ، شتێکمان بدەنێ بیخۆین .

لە شێوەی ئاخاوتنیان تێگەیین ئەمانە کێن . بووە هەراو زەنا زەناو مشتومڕێکی توند کەوتە نێوانیان . ئەمانە پاشماوەی بەرەی دوژمنانن ، ئایا دەسبەجێ بیانکوژن ، یان بیانبەنە لای خانی سەردار هۆز ؟ لە کاتێکدا ئەوان خەریکی کێشمەکێش بوون ، هەندێك ئافرەتی دڵو دەروون نەرم دەرفەتیات چەنگ کەوتو دووپارچە گۆشتی برژاوی هێستریان خزاندە نێو دەستی منداڵەکانەوە . بردیانن بۆ کن خان . منداڵەکان لەخواردن نەدەکەوتن . بردیانن بۆ تاوڵێکی سووری گەورە . پاسەوان بە تەپشووی زیوینی رووتەوە لەبەر دەرگا وەستابوون . هەواڵێکی پڕ مەترسی کەوتەوە ، ئەویش هاتنی منداڵەکانی سەر بە هۆزی قەرەغیری بوو ، کە لە شوێنێکی کەس نەزانەوە هاتبوون . ئای ئەوە چییە ؟ تێکڕا دەستیان لە جریتبازیو بەزمگێڕان هەڵگرای ئابوڕەی خەڵکەکە بە هەڵەداوان بەرەو ڕەشماڵی خان جمین . ئەوگاتە خان لەتەك گەورە جەنگاوەرانی لەسەر سەرینێکی سپی بە ڕەنگی شیر ، ڕۆنیشتبوو . شیری ماینو هەنگوینی فڕدەکرد . گوێی بۆ لاوژەو بەستەی پیاهەڵدان هەڵخستبوو . کاتێکی خان هۆی هاتنی خەڵکەکەی زانی ، گرژوتوڕەبوو نەڕاندی : « چۆن وێراتان هەراسانم بکەن ؟ ئەدی ئێمە سەرپاکی هۆزی قەرەغیزیمان قڕ نەکرد ؟ ئەوی نەمکردن بەفەرمانڕەوای ئینیسای تاهەتایە ؟ بۆ چی بەڕاکردن هاتونەتە لام و دەستتان بەخۆدا شۆڕکردۆتەوە هەی ترسنۆکینە ؟ سەیرکەن کێ بەرامبەرتان وەستاوە هسیەخان بانگی کردە ، پیرەژنی شەلەی

روولۆچاوی . کاتێك پیرەژن لە نێوان ئاپۆرەی خەڵکەکە وەهاتە پێش . خان فەرمانی پێدا :ـ بۆ لێرەوارەکەیان ببە ، کارێکی وابکە رێو رەچەڵەکی هۆزی کەرگیزی ئەبرێتەوەو ، ناوو ناتۆرەیان تاهەتایە کوێر دەبێتەوە بڕۆ پیرەژنە شەلەی روو لۆچاوی چیم گوتی وابکە .... » .

پیرەژنە شەلەی روو لۆچاوی ملی بۆ ئەو فەرمانە کەچ کردو ، دەستی کوڕو کچە منداڵەکەی گرت و دووری خستنەوە . بە نێوجەنگەڵستانەکەدا دوور رۆیشتن . تا لە بەرزایی یەکی هەزار بە هەزارەوە بە گوێ رووباری ئینیسای گەیشتن لێرە پیرەژن منداڵەکانی وەستاندن و ، لەسەر هەڵدێرەکە بەتەنیشت یەکی راگرتن و پێش ئەوەی هەڵیان بداتە خوارەوە گوتی :

– ئەی رووباری ئینیسای مەزن ، ئەگەر چیات تێ بهاوێن ، وەکو پلووکە بەرد لە بنت نقوم دەبێ ئەگەر دارکاژێکی سەد ساڵیت تێ فڕێدەن ، هەروەکو چڵە درەختێك رای دەماڵی . دەها ئەو دوو دەنگە زیخە ، ئەو دوو دەنگە مرۆیەش وەرگرە . زەوی بە خۆیان ناگرێ ئینیسای هەرچەندە بۆم نی یە ئەوە شت پێ بڵێم ، ئەگەر ئەستێرە بکرێن بەمرۆ ، ئەوا ئاسمانیان پێ تەنگ دەبێ ، ئەگەر ماسی بکرێن بەمرۆ ئەوا رووبارو دەریایان پێ تەنگ دەبێ با ئەو دوو منداڵە ، بە دوو گیانی بێ گەردو ویژدانێکی منداڵی یەوە ، ئەم دنیا ناهەموارە بەجێ بێڵن کە هێشتا باوڕی دزێو رەفتاری دزێو گلاوی نەکردوون . بۆ ئەوەی کوێرەوەری مرۆیان نە بینن و دەردەسەریش بەسەر خەڵکی تر نەهێنن دەبیانبە بیانبە . ئەی ئینسای مەزن ...

کوڕو کچە بچووکەکە دەستیان کردە گریان و هەنسکدان . ئەوان قسەی پیرەژنیان بەلاوە هیچ گرنگ نەبوو لە کاتێکدا هەرتەنیا تێروانینی هەڵدێرەکە تۆقاند بوونی لە ژێرەوەش شەپۆلە تورەکان بەیەکتر هەڵدەشاخان .

پیرەژنە شەلەی روو لۆچاوی وتی :

– بچکۆلەکانم بۆ دوایین جار دەست لە ملی یەك کەن و ماڵئاوایی لەیەکتر بکەن هەردوو ئەنگوچکەکانی گرتن تا لە هەورازەکەوە هەڵیان بدرێنێ هەروا وتی :

– بمبورن بچکۆلەکان ، ئەمە کردەی رۆژگارە هەرچەندی ئەوەی دەیکەم بەخواستی خۆم نییە بەلام بۆ ئێوە ئەمە چاترە .

هەرکە ئەم وشانەی لە زار دەرچوون ، لە نیشتی یەوە دەنگێك هاتە گوێی گوتی :

– راوەستە گەورە ژنی دانا دوو منداڵی بەستەزمان بێ تاوان مەکوژە .

پیرەژنە شەلەی روولۆچاوی ئاوڕی دایەوە لەم سەیرو سەمەرەیە زمانی گیرا رووانی شورێکی چاو گەورە لەبەر دەمی وەستابوو چاوەکانی بەخەم و پەژارەوە سەرنجیان دەدا شورێکی سپی بە رەنگی مانگایەکی تازەزاو هەروەك حوشترێکی جوان و بەرزگی بە توکێکی رەشی تاریك داپۆشرابوو قۆچەکانیشی هەرزەینەت بوو سەرنجیان لێ بدەی وەکو چرە دەوەنی پایز لك و پۆپیان لێ دەرچووبوو گوانی پاك و لووس بەوێنەی مەمکی ئافرەتێك تازە منداڵی بووبێ .

پیرەژنە شەلەی روو لۆچاوی گوتی :

– تۆ کێی بۆچی بەزمانی مرۆیان داخێوی ؟

وەلامی دایەوە :

– من دایکە شوورم ، بۆیە بەم شێوەیە داخێوم ، تا تێم بگەی و گوێ بۆ قسەکانم هەڵخەی .

– چیت گەرەکە دایکە شوور .

– منداڵەکان بەجێ بێلە ، ئەی گەورە ژنی دانا ، تکات لێدەکەم ، بیاندە بەمن .

– باشە تۆ چی یان لێ دەکەی ؟

– مرۆ هەردوو بچووکیان لێکوشتووم . دوو شووری وردیلە منیش بۆ خۆم بەدوای بێچواندا دەگەرێم .

– دەتەوێ بەخێویان بکەی ؟

– بەلێ ئەی گەورە ژنی خاوەن گوفتار .

پیرەژنە شەلەی روو لۆچاوی پێکەنینی هاتێ و گوتی :

– دایکەشوور ، تۆ چاکی تێ فکریوی ؟ ئەمانە بەچکەی مرۆن ، هەراش دەبن و بێچووە شوورە وردەکانت دەکوژن .

دایکە شوور وەلامی دایەوە :

– کە گەورەبوون بێچووە شوورە بچووکەکانم ناکوژن ، من دەبمە دایکیان ، ئەوانیش دەبنە بێچووم چۆن دەستیان دەچێتە

کوشتنی خوشك‌و براکانیان ؟

پیره‌ژنه شه‌له‌ی روو لۆچاوی سه‌رێکی باداو گوتی :

- کێ ده‌زانێ دایکه شوور ، تۆمرۆ ناناسی ئه‌وان به‌زه‌ییان به گیانه‌وه‌ری دارستان نایه‌ته‌وه ته‌نانه‌ت به‌زه‌یان به‌هاوڕه‌گه‌زی خوشیان نایه‌ته‌وه حه‌زم ده‌کرده ئه‌م دووبێ‌دایك‌و باوکه‌ت پێ سپێرم تاتێ‌بگه‌ی من راستیم پێ‌گوتوی به‌لام مرۆ ئه‌م دوو جووکه‌ش ده‌کوژن که واته تۆ بۆچی خۆت گوفتاری ئه‌م ده‌ردو به‌لایه ده‌که‌ی ؟

- هه‌ردوومنداڵه‌که ده‌به‌مه ولاتێکی دووره ده‌ست ، ده‌ستی که‌سیان پێ‌ڕانه‌گا . ئه‌ی گه‌وره‌ژنی دانا به‌زه‌ییت به‌م جووکانه‌دا بێته‌وه . رێیان به‌رده ، من ده‌بمه دایکی خاوه‌ن ئه‌مه‌کی ئه‌وان گوانم پڕبوون ، شیرم ده‌گریه‌و ئاره‌زووی جووکان ده‌کا شیرم منداڵی گه‌ره‌که .

پیره‌ژنی شه‌له‌ی روو لۆچاوی تاوێك داماو که‌وته بیرکردنه‌وه‌یه‌کی قووڵ :

- باشه ، مادامه‌کی وایه ، هانێ بیانبه‌و لێره به‌دووریان خه‌وه ئه‌م بێ دایك‌و باوکانه ببه بۆ ولاته دووره ده‌سته‌که‌ت به‌لام ئه‌گه‌ر له ڕێگای دوورو درێژ له‌ناو چوون‌و ئه‌گه‌ر ڕێگر کوشتیانن ئه‌گه‌ر به‌ره‌ی مرۆ پاداشتی چاکه‌تیان به‌خراپه دایه‌وه ، ئه‌وا ته‌نیا گازانده له خۆت بکه .

دایکه شوور سوپاسی پیره‌ژنه شه‌له‌ی روو لۆچاوی کردو ڕووی کرده کوڕو کچه منداڵه‌که‌و پێی گوتن :

- ئێستا من دایکی ئێوه‌م ئێوه‌ش بێچووی منن . ده‌تانبه‌مه ولاتی دوور له‌و شوێنه‌ی ده‌ریای گه‌رمی - ئیسیك - کۆل - ده‌که‌وێته نێو کێوه به‌فرینه به‌ره‌وار داپۆشراوه‌کانه‌وه کچه‌و کوڕه له‌خه‌نی خۆشیا شاگه‌شکه بوون‌و به گورجی به دوای دایکه شوور هه‌لیان کرده‌غار . دوای ئه‌وه شل‌و شه‌که‌ت بوون‌و پرزه‌یان له‌به - بڕا ڕێگاش دووره له ولاتێکی دنیاوه بۆ ولاتێکی‌تر . ئه‌گه‌ر دایکه شووری شاخدار شیری نه‌دابان‌و به‌له‌شی خۆی گه‌رمی دانه هێنایان قه‌ت نه‌یان ده‌توانی ئه‌وماوه دوورو درێژه بڕۆن . به‌ینیکی زۆر ڕۆیشتن گه‌لێك له کۆنه هه‌واری ئینیسای به‌دوورکه‌وتن هێنده‌یان نه‌مابوو بگه‌نه ولاتی تازه‌یان ئیسیك - کۆلهاوین‌و زستان ڕۆیشتن ، به‌هارو هاوین‌و ، پایزو هاوین‌و زستانێکی‌تر ، هاوینێکی ترو پایزێکی تر به‌ناو لێرستانه نوستووه‌کان‌و بیابانی گرگرتوو و پێده‌شتی پاستان‌و چیای هه‌زار به هه‌زارو ڕووباری توند ڕه‌و ڕۆیشتن . گه‌له گورك سه‌ری له دوو نان . به‌لام دایکه شووری شاخدار سواری پشتی خۆی کردن‌و ، له دڕنده‌و کێوی ده‌ربازی کردن‌و به دووری خستن راوچی به‌سواری ئه‌سپ‌و به تیره‌وه راویان نان‌و هاواریان ده‌کرد : « شوور به‌چکه‌ی مرۆی رفانده‌وه ! بیگرن سه‌ری له دوو نێن » . - تیریان تێ ده‌گرتن . دایکه شووری شاخدار له‌وانی رزگارکردن ئه‌و له تیر تیژڕۆتربوو ، ده‌یچرپانده گوێیان : « وردیله‌کانم توند بمگرن . ئه‌مه ڕاونانه » .

له کۆتاییدا دایکه شووری شاخدار منداڵه‌کانی گه‌یانده ئیسیك - کۆل . له‌سه‌ر چیایه‌که به‌سه‌رسامی‌یه‌وه وه‌ستابوون . ئه‌و شوێنه به‌زنجیره چیاوی به‌به‌فر داپۆشراو ده‌وره درابوو که‌وتبوه نێوان چیای به‌لێره‌واری سه‌وزه‌وه . شه‌پۆله‌کانی ده‌ریا پێك ده‌که‌وتن شه‌پۆلی سپی به‌سه‌ر ئاوی شینه‌وه ده‌ڕۆیشتن ، که له دووره‌وه با هه‌لی ده‌پێچان‌و به‌ره‌و شوێنی دووری ده‌بردن .

که‌س نازانێ ئیسیك - کۆل سه‌ری له کوێیه‌و بنی له کوێیه . له‌لایه‌که‌وه ڕۆژ هه‌لدێ که‌چی له‌لایه‌کی تر هێشتا شه‌وه . ئه‌و چیایانه‌ی ئیسیك - کۆلیان ده‌ورداوه له ژماره نایه‌ن . که‌س ناتوانێ هه‌لی بێنی چه‌ند کێوی سه‌ر به به‌فری‌تر له دوای ئه‌م چیایانه‌وه هه‌ن .

دایه شووری شاخدار وتی :

- ئه‌مه مه‌فته‌نی تازه‌تانه ئیدی لێره ده‌ژین‌و ، زه‌وی‌وزار ده‌چێنن‌و ، ماسی ڕاو ده‌که‌ن مه‌ڕومالات به نێو دێنن . هه‌زار سال به خۆشی لێره بژین باوه‌چه‌تان لێ بکه‌وێته‌وه‌و په‌ره بسێنێ . نه‌وه‌کانتان قه‌ت زمانی ئێوه له بیرناکه‌ن ئه‌و زمانه‌ی که بۆ ئێره‌تان هێناوه قسه گۆرانی به زمانی زگماك له زاریان خۆش‌دێ هه‌روه‌ك مرۆیان بژین ، منیش تاهه‌تایه له‌ته‌ك ئێوه‌و منداڵه‌کانتان ده‌بم .

ئا به‌م شێوه‌یه کوڕو کچه زارۆکه‌که که دوا پاشماوه‌ی هۆزی قه‌ره‌غیزی یان بوون ، له گوێ گۆلی "ئیسیك - کۆل"ی

نەمر نیشتمانێکی نوێیان چەنگ کەوت .

ڕۆژگار زوو بەسەرچوو ، کوڕەکە بووە پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەو کچەکەش بووە ئافرەتێکی پێگەیشتوو . ئینجا یەکتریان خواستو بوون بەهاوسەری یەك . دایکە شووری شاخدار خاکی ئیسیك ـ کۆلی بەجێ نەهێشتو لە لێرەوارەکانی ژیا .

جارێکیان گەردو کۆڵی بەیانی بوو ئاوی ئیسیك کۆل لە ناکاو بەکەفو کوڵ کەوتو شێتو هاربوو . ژنە ژانی منداڵبوونی هاتێ کەلێکی ئازاربێگەیشت ، پیاوە هەترەشی چوو بوو بەتەنگاوی چووە سەر گا بەردێكو هاواری‌کرد :
ـ تۆ لەکوێی دایکەشووری شاخدار ؟ ئاگات لێی‌یە ئیسیك ـ کۆل چۆن پێل دەدا ؟ کچەکەت منداڵی‌دەبێ خێراکە وەرە ، ئەی دایکە شووری شاخدار وەرە یاریدەمان بدە .

هەر ئەو کاتە زرینگەی زەنگوڵێکی بە چەند ئاوازی جودا هاتە گوێ کە لە دەنگی زەنگوڵەی کاروان دەچوو . دەنگی زەنگوڵە کە تا دەهات نزیکتر دەکەوتەوە دایکە شووری شاخدار هاتو لانکێکی بە شاخەکانیەوە هەڵگرتبوو لانکەکە لە داری درەختی لاولاوی سپی دروست کرابوو . لانکەکە زەنگوڵێکی زیوینی بچووکی پێدا شۆڕ کرابۆو ، زرینگەی لێ بەرز دەبۆوە ئەم زەنگوڵە تائیستا لەسەر لانکی منداڵەکانی ئیسیك ـ کۆل زایەڵەی دێ دایك لانك رادەژەنێو زەنگی زیوینیش دەلەرێتەوە هەر دەڵێی دایکە شوری شاخدارەو بەهەشتاوی دێ و لانکێکی لە داری لاولاو دروست کراوی بە شاخەکانی هەڵواسیوەو لەگەڵ بەدەنگەوە هاتنی دایکە شووری شاخدار بە دوای بانگەوازەکە دایکە منداڵکەی بوو .

دایکە شووری شاخدار وتی :

ـ ئەم لانکە بۆ کوڕە نۆبەرەکەتانە . خۆزیا منداڵی زۆرتان دەبوون . حەوت کوڕو ، حەوت کچ ! دایکەو باوکە گەشانەوەلە خۆشی دایکە شووری شاخدار کوڕە نۆبەرەکەیان ناونا (بۆغوبای) بۆغوبای جاحێل بوو کچێکی جوانکیلەی لە هۆزی‌کیتشاك خواستو ، بنەماڵەی بۆغا ـ کە لە دایکە شووری شاخدار کەوتبونەوە ، دەستیان بەزێدەبوون کرد . بەرەی بۆغی‌یان تا دەهات لە ئیسیك‌کۆل پەرەیان دەساندو هێزو گوڕیان پەیدا دەکرد . بۆغی‌یەکان وەك شتێکی پیرۆز پلەو ڕێزیان لە دایکە شووری شاخدار دەنا . لە دەرگای ڕەشماڵی ماڵە بۆغی‌یان نیشانەی شاخی‌شوور لە بە نەخش دەچنرا . تا لەدوورەوە بزانرێ خاوەنی ئەم ڕەشماڵە لە بەرەی (بۆغۆ)یە . کاتێك کە بۆغی‌یەکان بەرەنگاری هێرشی دوژمن دەبوونەوەو ڕمبازی‌یان دەکرد وشەی « بۆغو! » یان دەگوتەوە . بۆغی هەمیشە سەرکەوتوو دەبوون . لەوکاتە لە لێرەوارەکانی ئیسیك ـ کۆل شووری شاخداری سپی دەلەوەڕان کە لەجوانی‌و بەدەویدا ئەستێرەی ئاسمانیان شاگەشکە دەکرد . ئەمانە بنەچەکەی دایکە شووری شاخداربوون . کەس ئازاری نەدەدانو خراپەی لەگەڵ نەدەکردن . کاتێك بۆغی شوورێکی دەبینی لە ئەسپەکەی دادەبەزی‌و پێشی بۆ چۆل دەکرد جوانی کچیان بەجوانی شووری سپی دەچواند .

ژیان بەم جۆرە دەگوزەرا تا گەورە پیاوێکی ناودارو فرە دەوڵەمەندی بۆغی مرد . هەزار هەزار کاوڕو هەزار هەزار ئەسپی هەبوون تەواوی شوانکارەی هەرێمەکە لە راژەی ئەودابوون نەوەکانی ئەو داوەتێکی ماتەمینی گەورەیان بۆ سازدا لە هەرچوار کەناری دنیا بانگیان لە گەورە ناودارانی خەڵك گێڕاوە لە ماتەمینی‌یەکە ئامادەبن بە دووری کەناری ئیسیك ـ کۆل سەد هەزار ڕەشماڵیان هەڵدا هەرمەپرسە چەندیان مەڕو ماڵات کوشتەوەو چەندیان شیری ماین هەڵقوڕاندو بێ‌ئەژمار خواردەمەنی (کاشفاری) یان دابەشیەوە کوڕانی کابرای دەوڵەمەند بەلافو گەزافەوە دەهاتو دەچوون : تا خەڵك دەوڵەمەندی‌و پلەو پایەی نەوەکانی جوانەمەرگ بزانن ... (ئا کوریژگەی خۆم ، لەکارەساتی ئەو خەڵکەی بەدەوڵەتو سامانەوە دەنازن نەك بە هۆش‌و ئاوەزیان ..) .

خۆشخوانان بەسواری ئەسپی ڕەسەن‌و سەرو کلاوی لەکەوڵی دەڵەك دروستکراو شالی ئاوریشمی‌یەوە کە نەوەکانی کۆچکردوو پێیان خەڵات کردبوون ، دەهاتن‌و دەچوون‌و لە ستایش‌و بەشان‌و باڵ هەڵدانی جوانەمەرگو نەوەکانی نەدەکەوتن ..
یەکێکیان تێی هەڵدەکرد :

- لە چ شوێنێکی دیکەی ئەم سەر زەمینە ژیانی ئاوها خۆش‌و ڕەنگی ماتەمی ئاوها گەورەتان دیوە ؟

یەکێکی تر دەیگوت :

- لەو ڕۆژەوە دنیا دنیایە داوەتی وا سازنەدراوە .

یەکێکی تریش دەیگوت :

- تەنیا لای ئێمە ڕێز لە یادی دایك‌و باوکان دەگیرێ‌و پایەیان بەدەنرێ‌و باسی‌و خواسی چیاکیان دەربارە دەگوترێ .

یەکێکی تر تێی هەڵدەکردێ :

- ئای ، خۆشخوانان چەندتان گوفتی شیرین لە زاری دەتکێ ، ئەوە چیتانە ! چ وشەی واهەیە لە دنیادا شایانی ئەو پایە بەرزییە بێت‌و لە شان‌و شکۆی خوالێخۆشبوو بوەشێتەوە ! .

بەم جۆرە شەوو ڕۆژ بەیت بێـژ پێشبرکێی یـەکتریـان دەکرد . (« هێی ، کوریژگەکەم چەند نالەبارە ئاشق‌و بەبیت بێژ لە پیاهەڵدان داپێشبرکێی یەکتر بکەن‌و لە خۆشخـوانەوە ببنە دوژمنی لاوژەو گۆرانی ») .

ئەم بەزمی ماتەمی گێرانە وەکو جەژن چەند ڕۆژ درێژەی دەکێشا . کورانی کابرای دەوڵەمەند دەیانویست لە هـەموان دەرکەون‌و بەپێش هەموو خەڵکی دنیایە بکەون بۆ ئەوەی ناوو ئەورەتیان ئاسۆ دابگـرێ ویستیان شـاخی شووریـێك لەسەر گۆڕی باوکیان بچەقێنن تاهەموو خەڵك بزانن ئەم گۆڕە گۆڕی یەکێك لە پیاوچاکانی بەرەی دایکە شووری شاخدارە . («ئای ، کوریژگەکەم پێشینان لە کۆنەوە گوتویانە سامان‌و دارایی ، لە خۆبایی بوونی لێدەکەوێتەوەو ، لە خۆبایی بوونیش ملهوڕی لێوەبەرهەم دێ ») .

کورانی کابـرای دەست ڕۆیشتوو نیـازیان وابـوو ڕێزو شکۆیەکی ئەوتۆ بدەنە یادی باوکیان کە تا ئەوکاتە لە چەشنی ئـەو نەبـووبێ ، ئەمـەش باکیـان بە هیـچ نەبـوو ، هیچیش دەربەستی نەدەکردن ڕاوچی‌یان هەنارد ، ڕاوچی شوورێکیان ڕاوکردو قۆچیان بڕیەوە . قۆچـەکان پـانبوون دەتگـوت باڵی هەڵۆیە لەفڕیندا هێند جوانبوون هەر زەینەتبوو سـەیریـان بکەی‌و لێیان بنۆڕی ، هەریەکەیان هەژدە لکی لێبـوو بۆوە . ئـەمەش واتـە تەمـەنی هەژدە سـاڵە کورەکـان زۆر کـەیف خۆشبوون فەرمانیان بە کـارزانانـدا ئـەم شاخـانە لەسـەر گۆڕەکە بچەقێنن .

پیـرەمێـردو ڕیش سپی نـارەزایی خـۆیـان لەمکـارە دەربڕی :

- چـۆن شوورتـان کوشت ؟ کێ‌زات دەکـا دەستی لەئاست نەوەکانی دایکە شووری شاخدار بەرزبکاتەوە ؟

کوڕانی کابرای دەوڵەمەند وەڵامیان دانەوە :

- شوور لەسەر خاکی خۆمان کوژراوە هەرچی‌یەك لەسەرخاکی ئێمە بڕواو بفڕێ‌و بخشێ لەمێشەوە هەتا حوشتر هی ئێمەیە ئێمە دەزانین چی لە شتی خۆمان دەکەین بڕۆن لێرە مەمێنن .

خـزمەتکـاران ڕیش سپییـان وەبـەر قـامچیـان داو ، بەرەودوا سواری ئەسپیان کردن‌و هەڵەتەو ڕیسوایان کردن .

لەو ڕۆژەوە دنیـا گۆڕا کـارەساتێکی گـەورە بـەسـەر نەوەکانی دایکە شووری شاخداردا هات خەڵك تێکرا کەوتنـە ڕاوی شووری سپی نێو دارستانان‌و هەموو کـەسێکی تیرەی بوغی‌یان بەئەرکی دەزانی شاخی شوور لەسەر گۆڕی باپیرانی بچەقێنێ ئیستا کارەکە بۆتە کاری چاکەو نیشانەی پایەداری کۆچکردوان ئەوەی شاخی وەدەست نەهێنابا شایانی ڕێزلێنان نەدەبوو . بازرگانیەتی شاخی شوور داکەوت‌و گـردو کۆیـان دەکردنەوە . هـەروا کەسـانێکی‌وا لەنەوەی دایکـە شووری شاخدار پەیدابوون پیشەیان بووە وەدەست هێنان‌و فرۆشتنی شاخی شوور . (ئای کوریژگەکەم ، لەکوێ پارە هەبێ وتـەی جوان لە نێو دەچێ‌و جوانی نامێنێ) .

لە لێرەوارەکانی ئیسیك‌ـ کۆل ڕۆژی نـەمان ، لە نـاو چونی شوور داهات . بێ بەزەیی دەیانکوشتن شوور ڕەویان کردو خۆیان گەیاندە ناوچە هەڵەتەکان بەلام لەوێش سـەریان لەدوونان . ڕەوە سەگیان تێبەردان تـا بەسـەر بۆسـەی تیر هاوێژان دابکەون ، ئەوتیرهاوێژانەی یەکاوتیر دەیان ئەنگاوتن شوور پۆل پـۆل لە نێو دەبـران مێکەلی تـەواویان بـەجارێـك دەکوشتن گرەویـان لەسەر بـەدەست هێنانی شـاخەکـانیان دەکرد ، تابزانن کێ شاخی چرو پڕتر پەیدادەکا .

شـوور لەبەرچـاوان ون بوون‌و چیـاکانیـان چۆڵکـرد نەنیوەشەو نەبەیان بەردان دەنگی شوور نەدەهاتە گوێی کەس

له هیچ دارستان‌و له هیچ په‌نایه‌ك نه‌ده‌بینراو كه‌س نه‌ی ده‌بینی چۆن شاخی هاوێشتۆته سه‌ر پشت‌و ڕه‌و ده‌كا چۆن بـه‌سه‌ر كه‌ندو له‌ندان بازده‌داو وه‌ك باڵدار ده‌فڕێ خـه‌ڵكانێـك هاتنـه دنیاوه له ژیانیا شووریان نه‌دیبوو به‌ڵكو ته‌نیا چیرۆكیان ده‌رباره بیستبوون یان شاخیان له‌سه‌ر گۆڕان دیتبوون .

دایكه شووری شاخدار چی به‌سه‌ر هات ؟

ڕه‌نجا ، زۆر له‌خه‌ڵكه‌كه نیگه‌ران بوو ده‌ڵێن پاش ئه‌وه‌ی شوور له سۆنگه‌ی گولله‌و سه‌گی ڕاو گوزه‌رانیان لێ‌ته‌نگ‌كراو پاش ئه‌وه‌ی شوور كه‌م بوونه‌وه‌و ژمـاره‌یان له پـه‌نجه‌كـانی ده‌ست ڕه‌تی نه‌ده‌كرد دایكه شووری شاخدار به‌ره‌و بڵندترین ترۆپكی چیایـان هه‌ڵكشـاو ماڵئـاوایی له‌ئیسیك ـ كـوڵ كردو دوانه‌وه‌كانی خۆی له‌ڕاڕه‌وه چیایی‌یه گه‌وره‌كه ئاوا كـردو بۆ ولاتێكی ترو بۆ چیایه‌كی تری بردن .

ئه‌مه‌یه له‌م دنیایه‌دا ڕووده‌دا ئه‌مه ته‌واوی به‌سه‌رهاته‌كـه‌یه حه‌ز ده‌كه‌ی بڕوا بكه‌و حه‌زیش ده‌كه‌ی بڕوا مه‌كه .

كاتێك دایكه شووری شاخدار ڕۆیی گوتی ئیتر هه‌رگیز نایه‌مه‌وه ...

تێبینی : ئه‌م چیرۆكـه به‌شێكـه له ڕۆمانی كـه‌شتی‌یه سپی‌یـه‌كه
نوسینی : جه‌نگیز ئایتماتوف .
بڕوانه :
السفینه البیضاء ـ روایة ـ جنكیز ایتماتوف دار الفارابي ـ بیروت ١٩٨١ .
تـرجمة : عبـدالله حبة . مـراجعة وتقـدیم : سعیـد حـورانیـه . ص(٦٢ ـ ٧٤) .

**فه‌رهه‌نگۆك :**

دژوار : سه‌خت
كلوور : سه‌روه‌ت‌و سامان
ڕێوره‌سم : نه‌ریت‌و ڕێ‌و شوێن
كۆك‌و ته‌یار : ئاماده
پۆشاك : جل‌و به‌رگ
په‌ڕه‌وڵ : ته‌یروتوو
بێشه‌لان : جه‌نگه‌ڵ ، لێره‌وار
زكابه‌ری : دوژمنكاری
داوو ده‌هۆ : پیلان
پاكتاوكردن : قڕكردن ـ تصفیه
ئه‌نگاوتن : پێكان
زیرووح : گیان له‌به‌ر
ئاگرویه‌ردوو : خۆڵه‌مێش . مشكی
بێ‌ئه‌نوا : بێ‌كه‌س بێ‌ده‌ره‌تان
ترۆپك : لوتكه
ئاخاوتن : قسه‌كردن
تاوڵ : ڕه‌شماڵ
ئاپۆره : حه‌شامات
دزێو : ناشیرین
هه‌ڵدێر : هه‌ورازی سه‌خت
هه‌راش : گه‌وره
گرفتار : دووچار
به‌نێوهێنان : په‌روه‌رده‌كردن
پێل ده‌دا : شه‌پۆل ده‌دا
زایه‌ڵه : ده‌نگدانه‌وه‌له‌رینه‌وه‌ی ده‌نگ
به‌ده‌و : شۆخ‌و شه‌نگ
بێ‌ئه‌ژمار : بێ‌حسێب
لاف‌و گه‌زاف : له خۆبایی‌بوون
ده‌وله‌ت : سه‌روه‌ت‌و سامان
خۆشخوان : گۆرانی بێژ
هه‌ڵه‌ته كردن : ڕاونان
ناوچه‌ی هه‌ڵه‌ت : ناوچه‌ی عاسێ
نیگه‌ران : دڵته‌نگ‌و زویر
له سونگه‌ی : به هۆی
شوور : بزنه كێوی (وعل)
كلاوی ده‌ڵه‌ك : فرو القندس

**په‌راوێز**

- دایكه شووری ساخدار : الوعلة لام ذات القرون .
- چیڤیت : سواری جه‌نگاوه‌ر به زمانی گه‌لانی ئاسیای ناوه‌راست

هاشم علي مەندی
ڤییەنا ـ نەمسا

# شانۆ لەعیراقی پێشین دا*

شانۆش وەکو هەموو ڕەنگە هونەری یەکانی تر ڕەگی ەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زوو . « لەکسیکای شانۆی جیهانی » ناوی « شانۆی کۆن » ی ناوەتە سەر ئەم جۆرە شانۆگەریانەی لە سەردەمە کۆنەکانی رابوردوو بەرچاو ەکەون . هەرە کۆنترین شێوەی شانۆگەری « سەمایە » کە کو ئێستا لای میللەتە پاشکەوتووەکان بەکار دەهێنرێ ، خود لە سەر بەردو و دیواری ئەشکەوتەکانو ئێسکی ئاژەل ەسم کراون .. یا ئەوەتا لای میللەتە پێشکەوتووەکان بوونەتە ەنگێك لە کەلەپووری نەتەوایەتی میللی .

ئەم جۆرە سەمایانەش چەندەها مەبەستیان هەبووە ، وەکو دارشتنی « ڕاوکردن ، دروێنە ، هێزو توانای پیاو ، نەرمو سکی ئافرەت » یاخود « ئاهەنگەکانی چوار وەرزی سال ، وی ، نوێژو دوعا بۆ رزگاربوون لە زالی سرووشت بە سەر مرۆڤدا » هەروەها بۆخۆشی دەربڕین بە هۆی سەماکردن ، بۆ ەوەی بە کۆمەلو لە سەر خۆبگەنە ڕادەیەك لە خۆشی کە خۆیان ە بیر بکەنو ئێشو ئازاری کاری ڕۆژانە لە یاد بکەن .

بەرهەمە شانۆگەری یەکانی پێشوو « کۆن » زۆر ەلیمنتی « عناصری » شانۆگەریی هەبووە وەکو ماسك « قناع » ، جلو بەرگی تایبەت ، ئێکسسوار ، دیکۆر ، هەروەها مۆسیقای تایبەت .

هەروەهاش دەوریان تیا بووەو کەسانی خۆیان هەبووین ، وەکو دەوری خواکان ، ئەژدەها ، ئاژەل ، هێزەکانی تری سرووشت » . سەماکان شێوەی « پانتۆمیمیان » هەبووە کە جارجاریش بە گۆرانی ووتراوە . تەختی شانۆش بێگومان دیارکراوەو « مەلبەندو دەشتی » تایبەت بە سەماکردن بووین ، ئەم مەلبەندانەش لەگەل « ئۆرکێسترا » ی شانۆی یۆنانی « ئەگریکی » بەراورد دەکرێن .

بەلام لە گەل ئەم هەموو نیشانەو راستیانەشدا ئەم کارە بە « کار ـ فعل » ی شانۆیی دانانرێ چونکە « بینەر » لە گەل « ئەکتەر » جارێ لەیەك جیا نەکراون ، هەروەها دەوری مرۆڤ لەسەر تەختە نیشان نەدراوە .

بۆیە هەموو ئەو هەولانەی دراون بۆ چەسپاندنی ئەم تیوری یە کە « ئەم ڕوو داوانە » ڕووداوی شانۆگەریین سەریان نەگرتووە .

### ● لیتراتور « ئەدەب » ی عیراقی کۆن ●

بێگومان بۆناسینی شانۆ پێویستە مرۆڤ خۆی هەندێك لە ئەدەبی ئەو سەردەمە نزیك کاتەوە .

تائێستا پتر لە « ٥٠٠٠ » پارچە بەرد دۆزراونەتەوە کە تایبەتن بە باری لیتراری « ئەدەب » ی عیراقی کۆن ، کە تەمەنی تازەترینیان ئەگەڕێتەوە بۆ دوو سەد سال پ . ز. هەموویشیان لە بارەی « ئایین ، ڕەوشتو ، ناوەرۆکی » کۆمەلگای عیراقی ئەو سەردەمە ئەدوێن .

بەشێکی زۆری بەرهەمی سەردەمی سۆمەری یەکان لە کۆتایی سەدەی ڕابردووەوە دۆزراونەتەوە ، بەلام تا ئێستا ناوەرۆکی ئەو هەموو بەرهەمانە لە لایەن ڕۆژهەلاتناسەکان



وەرنەگێڕدراون و کەسیش لێیانەوە ئاگادارنیە .

بۆ بەڵگەش داستانی « گلگامش » تا ئەم ماوەی دوایی یە بە شێوەیەکی تەواو نەناسرابوو ، تاوەکو « سۆمەرناسەکان » ی عیراق دۆزیانەوەو پەردەیان لە سەر لایەنە ناسراوەکانی ئەم داستانە هەرە گەورەیە لادا .

بەڵام ئەوەی تائێستا لە بەرهەمە سۆمەری یەکان وەرگێڕدراون بریتین لە :

« ٣٠ » داستان ، « ٢٠ » دوعا بۆ خواکانی ئەو سەردەمە « ٩ » چیرۆکی بە ناوبانگ لە بارەی پاڵەوانانی سۆمەر ، « ٢٠٠ » گۆرانی میللی لە هەموو بابەتێك ، کۆمەڵێکی زۆر لە گۆرانی خەفت « نواح » ، ژمارەیەك لە راپۆرتی مێژوویی گرینگ ، چەند نووسراوێك لە بارەی فەلسەفە ، هەندێك لە پەرتووکی قوتابخانەکان ، چەند بابەتێك لە دادگاکانی ئەو سەردەمە ، پەندی پێشینان ، ئاگاداریی رەسمی و ، زۆر هەواڵی دیکەی هەمە ڕەنگ .

پتر لە « ٣٠٠٠٠ » ڕستە لەم نووسراوانە لە چەشنی هەڵبەست « شیعر » نووسراونەتەوەو بوونەتە نموونەی کۆنترین بابەتی ئەدەبی ی ئەم سەر زەمینە .

بۆ جاری یەکەم لە ساڵی ١٨٧٥ ز لە لەندەن گۆرانی یەکی درێژ وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی کە تایبەت بووە بە خواکەیان « ایناناـ Inanna » لە پاشان لە ساڵانی « ١٨٨٤ و ١٨٩٠ و ١٩٠٢ » ی ز چەند بەرهەمێکی تر وەرگێڕدراونە سەر زمانی ئینگلیزی . لە سەدەی ئێستامانیش بەشێکی زۆر کتێبی لەم بابەتە کەوتوونەتە بازار .

سۆمەری یەکان وەکو باسیان لێوە دەکرێ لە سا « ٢٨٠٠ » ی . پ ز دەستیان کردووە بە نووسینی بەرهەم ئەدەبیان ، ئیتر لە دوای ٥٠٠ ساڵ بەرهەمێکی زۆریا نووسیوەتەوە ، تاماوەیەکی دووریش بڕوا وابوو ک سۆمەری یەکان ئەدەبییان تەرخان کردبوو بۆ خوێندن پەرستگاکانیان « مەعبەدەکانیان » لە لایەن پیا ئایینیەکانەوە .

## ● گۆرانی ی ئایینی ●

گۆرانی ی « سروودی » ئایینی سۆمەری یەکان چەشنی هەڵبەست نووسراون و ناوەرۆکیان لە بنچینە هۆیەکانی ژیان دەدوێن .

لە سەرەتادا لە دروست کردن و بەڕێوەبردنی زەمە دواون . پەیدابوون و لە دایكبوونی خواکان ، خۆشەویستی رقیان ، هەوڵیان بۆ تۆڵەسەندن ، دڵنەرمییان و بەجێهێناد دوعای خەڵکی ، خولقاندن و دروست کردنییان لە پا تێکشکاندنیان بۆ هەموو شتێك .

بەڵام زۆر کەم باسی شەڕی نێو خواکان لەسەر تەخت هێزکراوە ، وەکو بە ئاشکرا لای خواکانی ئەگریکی یەکا ئەبینرێ . بەڵام لەو بابەتە کەمانەی کە بەرچاو دەکەون دیار داوە کە خواکانی سۆمەر زۆر بە توندی خەباتیان لە دژ

یەکتری کردووەو زۆر خوێنیان لەو ڕێیە ڕژاندووە .

سۆمەرییەکان زۆر بە فامانە چیرۆکەکانی خواکانیان ئەگێڕنەوەو لەسەر بناغەیەکی تیۆلۆجی « ئایینانە » و خۆیان تێکەڵی سەروباریان ناکەن .

چیرۆکەکانیش ئەمانەن کە تائێستا وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی تر :

● دوانیان ، خوا « انلیل » دەوری سەرەکی ئەبینێ .

● چواریان ، خوای ئاو « انکی » دەوری یەکەم ئەبینی .

● یەکێکیان باسی خوای مانگ ئەکات « ناناسین » و سەرهاتی شەرەکەی .

● دوانیتر لە خوای باش زورو « نینورتا » ئەدوێ .

● پێنج چیرۆکیتر باسی خوا « اینانا » ئافرەتە ـ دەکات .

● شەشیان چیرۆکی خوا « دیموزی » ئەگێڕنەوە .

● چیرۆکێکیان باسی خوای « بەدووەکان » ـ مارتو ـ ئەکات ، دراوسێی ڕۆژ ئاوای سۆمەر.

● چیرۆکی تۆفانیش « الطوفان » لە ناو چیرۆکێکی تریشدا هاتووە ، کە نە سەرەتایی و نە دوایی ماوە .

● چیرۆکی قارەمانان ●

گومان لەوەدا نییە کە سۆمەرییەکان یەکەمین گەل بوون لە بەکارهێنانی ئەدەبی ئەفسانەیی « الادب الملحمی » و بەرەپێدانی . ئەوانیش وەکو گەلانی تری جیهان ، وەکو ئەگریکییەکان ، هیندو ئارییەکان ، ئەلەمانەکان قۆناغی قارەمانیەتیان لە ئەدەبدا بڕیوە ، بۆ ئەوەی ناوبانگێك دەربکەن و خۆشیان بە دۆست و دوژمن بناسێنن .

ئەم شێوە ئەدەبە لە نێو کۆمەڵی حوکم ڕەواکان « پادشاو میرەکان » پەرەی سەند لەوکاتەی کە ئەوان دەرگای کۆشك و کەلەخانەکانیان بۆ شاعیرو حیکایەتخوانەکان خستبووە سەرپشت و بۆ ئەوەی جۆرە پڕوپاگندەیەك بنوێنن .. ئەگەرچی ئەو جۆرە شەوچەرانە بۆکات بەسەربردن بوو ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مەبەستێکی ئیعلامیشی تیادا هەبوو .

بۆ جاری یەکەم بەر لە ٣٠٠٠ ساڵ پ . ز شاعیرو ئەدیبانی ئەو سەردەمی سۆمەرییەکان دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی بەرهەمی میلی لە گۆرانی و چیرۆك ، چوار چیرۆك لەو « نۆ » چیرۆکەی کە دۆزراونەتەوە باسی « قارەمانێتی « انمرکارو لوگال باندا » دەکەن . بەشەکەی تریش کە « ٥ » چیرۆکن بەسەرهاتی قارەمانی بەناوبانگی سۆمەر « گلگامش » دەکەن و بە شێوەی گۆرانی دەیگێڕنەوە ، لەو پێنج چیرۆکە گۆرانییە دووانیان بە ناتەواوی ماونەتەوە کە ئەمانەن « گلگامش و گای ئاسمان » و « مردنی گلگامش » ، سێیانیش بە پارێزراوی وەدەست کەوتوون کە ئەمانەن : « گلگامش و ئاغای کیش » کە تیایدا گلگامش وەکو خەبات کاری و پارێزەری حوکمی پاشایەتی لە قەڵەم دراوە ، وە « گلگامش و شاری زیندووان » لەم چیرۆکەشدا دەوری قارەمانێ دەبینێ کە ئەژدهاکە دەکوژێ ، هەروەها « گلگامش و ئەنکیدۆو ژیانیتر » لەم چیرۆکەشدا شەخسیەتی گلگامش بە ووردی دەخرێتە بەرچاو ..

● سروودی میلی ●

سرووده میللیەکان بەشێکی دیکەی ئەدەب و هونەری سۆمەرییەکان بوون ، بەشێکی زۆری ئەو سروودانەیش دۆزراونەتەوە . لەوانە هەندێکیان بریتین لە « ٥٠ » ریز ـ واتە دێر هەندێکی تریشیان بریتین لە « ٤٠٠ » ریز .

ئەو سروودانەش لە چوار جۆر پێکهاتوون ، « سروودی تایبەت بە خوداوەندەکان » ، « تایبەت بە حوکم ڕەواکان » ، « نوێژو تاعەت بۆ حوکم ڕەواکان » ، هەروەها « سروودی ئایینی »

ئەو سروودانەی کە تایبەتن بە خوداوەندەکان یان ئەوەتانێ لە جۆری « ئەمرو نەهی » ن ، یاخود بۆ « مەدح و سەنا » ن ، بۆیان .. بە ناوبانگترین و درێژترین سروود لەو چەشنەی کە لە سەرەوە پەنجەمان بۆیان کێشا ئەمانەن : سروودی « انلیل » ، سروودی « انخدوانا » کچی سرجون مەلیکی « اکد » و بە ناوبانگترین « راهبەی » پەرستگای « اور » ئەو سروودەی تەرخانی کردبوو بۆ « اینانا » ، سروودی سێیەمیش هەر بۆ « اینانا » تەرخان کراوە کە یەکێك لە نیشانەکانی ئەوەیە ، بە ئەستێرەی شەو ناسراوە ، چوارەمیش هەر بە ناوی خوای جەنگ « اینانا » ناسراوە بەڵام



سروودی پێنجەم تایبەتە بە خوای هەتاو « اوتو » کە لە هەمان کاتدا خوای عەدالەتبووە ، سروودی شەشەم باسی خوای رەوشتو ئەخلاق دەکات « نانشا » حەوتەمیش تایبەتە بە خوای پزیشکیی « نینیسیا » ، هەشتەمیش تەرخانکراوە بۆ خوای خواردنەوە « نینکاسی » و سرووودی نۆیەمیش تایبەتە بە « نونگال » کچی خوای « ارش کیفل » وەکو قازیی گەلی سۆمەر .

ئەمەیان سەبارەت ئەو سروودانەی کە لە خوداوەندەکان دەدوان یا بۆیان دەووتران . بەلام بەشێکی تر لە سروودە میللیەکانی گەلی سۆمەر ئەوانەن کە بۆ قارەمان « شولگی ـ sholgi » بوو ، دووەم مەلیکی ئور لە بنەماڵەی سێیەم .. کە پتر لە حەوت سروودی لەسەر نووسراوە.

دوو سروودیش بۆ مەدحی باوکی « اورنمو ـ Jmammw » ووتراون ، لە پاڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە سروودەکان تەرخان کراون بۆ بنەماڵەی حوکمرانەکانی « ایسن ـ nisl » لەوانیش وەکو بەڵگە « Iddindagan, Ishmedagan, Lipitishar » .

بە سۆزترین سروود لای خەڵکی ئەو سەردەمی شارستانیەتی سۆمەر ، سروودە ئاینیەکان بوون ، کە لە کاتی نوێژو عیبادەتدا دەووتران یان بۆ دیارکردنی خۆشەویستی بەرامبەر حاکمەکانی ئەو زەمانە ، ئەو خوداوەندانەش کە هەمیشە لەم جۆرە سروودانە ناوبراون ئەمانەن :

Enlil, Enki, Nannasin, Ninurta, Nergal, Innana, Bau, Ninisinna.

لە مەلیکەکانیش بە تایبەت مەلیکەکانی بنەماڵەی سێیەم لە « اور » و بنەماڵەی یەکەم لە « ایسن » کە بەردەوام لەم سروودانەدا وەبەرگوێ دەکەون ..

هەروەها جۆری چوارەم لە سروودە میللیەکان ئەوانەن کە لە شوێنی عیبادەت ، پەرستگاکانی ئەو سەردەمە خەڵکی دەیانگوتن ، وەکو سروودی « ایکور ـ EKur » لە پەرستگای « انیل » لە شاری نیپور ، هەروەها سروودی تایبەت بە خوداوەند « نینو خورساك ـ Ninchorsag » لە شاری کیش کە بە درێژترین سروود دانراوەو بریتیە لە چوارسەد ریز . بەلام هێشتا بەشێکی زۆر لە پاشماوەی ئەدەبی ئەم گەلە نەدۆزراوەتەوە ، بە تایبەت لە شارەکانی کیش ، اور ، اکدو ، شارەکانی دیکە ..

## ● گۆرانی گلەیی ●

لێرەدا کە ناوی « گلەیی » یم ناوەتە سەر ئەو گۆرانیانەی خەمو خەفەت دەرئەبرن ، مەبەستم ئەوەیە بڵێم هەموو ئەو جۆرە گۆرانیانەی کە میللەتان پێکیان هێناون بۆ ئەوەی باسی بەسەرهاتەکانیان بکەن ، تەنها لە شێوەی گلەییدا دارێژراون .

لای سۆمەرییەکانیش دوو جۆر گۆرانی گلەیی هەیە ، ئەوانەی بە سەر شارەکاندا ووتراون ، وەکو چۆن ئەو شارانە لە ناو چوون ، ئەوانی تریش تایبەتن بە خوای خواکان « دیموزی ـ Dumuz » .

دوو گۆرانی لە جۆری یەکەم باسی لە ناوبردنی شاری « اور » ئەکات ، سێیەمیشیان تێکشکاندنی شاری « نیپور » ە ئەم جۆرە گۆرانیانەش بە چەشنێکی پڕ لە ئومێد کۆتاییان پێ دێن ، بە ئاواتی ئاوەدان کردنەوەی شارەکە سەر لە نوێ .

لە گۆرانییە تایبەتەکانی خوا « دیموزی تموز » ژمارەیەکی زۆر بڵاوکراونەتەوە تائێستا ، بەڵام

رۆژهەلاتناسەکان تائێستا سەبارەت بە ناوەرۆکەکانیان یەك ناگرنەوە .

لە پاڵ گۆرانی گلەیی ، جۆرێکی تر لە گۆرانیی لەو سەردەمەدا هەبوو کە وەکو بەشێکی گرینگ لە ئەدەبی سۆمەری ناسرابوو ، ئەویش ئەو گۆرانیانە بوون کە بەسەر مردووەکاندا دەووتران ، لەو گۆرانیانەش چەند گۆرانی‌یەکی لەم دواییەدا دۆزراونەتەوەو بلاوکراونەتەوە . ئەدەبی سۆمەری چەند جۆرێکی تری لە سامانی نەتەوایەتی هەبووە وەکو : پەندی پێشینان‌و دارشتنی بەسەرهاتەکانی ئەو سەردەمە بە شێوەیەکی ئەدەبی .

رۆژهەلاتناسەکانیش دان بەوەدا دەنێن کە ئەم ئەدەبە نەمرە لە سامانی زۆر نەتەوەی تردا جێی خۆی کردوتەوە .. بۆیە زوربەی ئەو ووتانە لە کتێبە ئایینیەکاندا دەبینین ، وەکو : تەورات ، انجیل ، هەروەها قورئانی پیرۆز ، بۆ بەلگە چیرۆکی « لافاو ـ الطوفان » و دروستبوونی ئەرزو ئاسمان‌و ژیان ، هەروەها مەسەلەی قابیل‌و هابیل .

رۆژهەلات ناسەکان دەلێن کە داستانی « ئەلیاذەو ئۆدیسا » ی ئەگریکی لە راستیدا لە ئەدەبی سۆمەری‌یەکان وەرگیراوە ، ئەم راستیەش بەر لە ٥٠ ساڵ سەلمێنراوە ..

**● ئەدەب‌و شانۆگەری ●**

بۆیە دەلێین ئەدەب‌و شانۆگەری نەك ئەدەبی شانۆگەری ، چونکە ئەوسا ئەم جۆرە ئەدەبە وەکو ئێستا نەناسرابوو ، بەلام لەگەل ئەوەشدا تارادەیەك دوو رەوشتی شانۆگەری لە بەرهەمە ئەدەبیەکاندا ـ ناسرابوون.

با وەکو بەلگە یەکێك لە گۆرانی‌یە گلەییەکانی ئەو سەردەمەی سۆمەر هەلبژێرین کە ئەویش شێوەی « ئورە » ..

ئەم پارچە ئەدەبی‌یە رۆژهەلاتناسی ئەلەمانی « کرمر » لە ساڵی « ١٩٣٥ » دا دۆزیەوەو دوای دە ساڵ وەریگێراوەو بلاوی کردوتەوە ، کە تیایدا باسی خوای شاری « ئور » « نینگال ـ Ningal » و خۆشەویستی‌ی خوای مانگ ئەکریَو ، ئەوە نیشان دەدا کە چۆن شاری ئور لە ساڵی ٢٠٠٠ پ . ز لەناو ئەچێت .. « شیوەنی ئور » بریتیە لە ٤٣٥ رستە بەلام کۆتایی‌یەکەی جاریَ نەدۆزراوەتەوە ، رۆژ هەلاتناس « فالکن شتاین ١١ هەلبەستی بەراوردکردووەو تیایدا ناوی بەشێکی زۆری لە ئامێری مۆسیقای ناسیوەتەوە .

لە بەشی یەکەمی شیوەنەکەدا باسی هێرشی لەشکەری عیلام دەکات بۆ سەر شاری ئور ، لە بەشی دووەمدا گلەیی لە خوای رەشەباو ئاگر دەکات چونکە ئەوان بوونە هۆی سووتانی شارەکە لە دوای شەرێکی دوورو درێژ .

« رۆزن گارتن » ی رۆژهەلاتناس گەیشتە ئەو راستیەی کە شانۆگەریەکەی « أسخیلۆس » ی « فرس » لەم پارچە ئەدەبی‌یە وەرگیراوە .. چونکە « کور » لەلای هەردووکیان هەمان دەور ئەبینن‌و بەشێکی زۆر لە ووتەکانیان لەیەك دەچن .

« کوریش » لە سۆمەری‌یەکان وەکو ووتمان لە « کور » ی ئەگریکی ئەکات چونکە لێرەدا هەمان جۆر لە « کور » ئەبینین وەکو [ « کور » ی گەل » ] ، [ کوری شیوەن ] [ کوری گۆرانی بێژ ] لێرەشدا بەشدارانی کور دەبنە دوو بەش .. یەکەمیان : نوێنەری « کار » ن‌و دووەمیشیان . نوێنەری « رەوشت » .

لە کوری سۆمەری‌یەکان وەکو چۆن لای ئەگریکی‌یەکان مرۆڤێك ئەبێتە سەرۆکی کور ، ئەم کەسەش لای سۆمەریەکان ناوی « گالا ـ Gala » بوو ، هەر ئەویشە کە دەوری سەرەکی، واتە دەوری پالەوانیەتی دەبینیَ .

ئاشکراش بووە کە ئەکتەرەکان لەسەرەتاو کۆتایی پێشکەشکردنی بەرهەمەکانیان خۆیان بۆ جەماوەر دەچەماندەوە ، وەکو رێزگرتنێك ، چونکە ووشەی سۆمەری « Ki-shub-gu » لە هەموو پارچەیەکان شانۆگەری هەیە .. ئەم ووشەیەش مانای چەماندنەوە دەگەیەنیَ « Schub » هەروەها « Ki » و « Gu » مانای سەرلەقاندنە .. هەلبەستەکانیش لە ژمارە ٢١٢ تا ٢١٨ باسی چەند مەلبەندو شوێن دەکات کە لەوێ شانۆگەری‌یەکان پێشکەش کراون .. ئەمەشیان ئەوە دەگەیەنیَ کە لە کات‌و شوێنێکی تایبەتدا بەرهەمەکان پێشکەش بە جەماوەر دەکران .

**شانۆی بابل :**

لە ڕاستیدا تائێستا ئاشکرا نەبووە ئایا ئەو شوێنانەی ئەو بەرهەمە شانۆگەریانەی ئەو سەردەمی کۆنی عیراقی پێشکەش ئەکران لە چ لە شانۆ ئەچوون ، بەلام لە نزیکی شاری بابـل « حلە » شانۆیێك دۆزراوەتەوە لە چەشنی ئەگریکی دەکات ، بۆیە هەر بەو ناوەش ناسراوە . بەر لەوەی وەسفێکی تەواوی ئەو شانۆیە بکەین دەبێت دان بەوەدابنێـین کە ئـەو شانـۆیە لەوانەیە بۆ مەبەستی وەرزشی‌ی بەکار هێنرابێ تاماوەیـەکی زۆر ، بـەلام دەبێت هەروەهـا بۆ مـەبەستی پێکـەش کردنی بەرهەمی شانۆگەریش بەکارهێنرابێت .. جگە لەوە ئاشکرایە کە بەشی زۆری سامانی شارستانیەتی ئەو سەردەمە هێشتا هەر لە ژێر خاکەو ئەو سامانەیش سەروەتێکی گەورەی شانۆیە .

شانۆی ئەگریکی لە بابل دەکەوێتە دووریی « ٥٦٠م » بۆ لای خوارووی ڕۆژهەلات لە سنووری ناوەوە .. لەسەر گردی خواروو « الحمیرة » کە یەکێکە لە سێ گردی بەرزلەوناوچەیە ، ناوەکەیشی « الحمیرة » لە سووری خـاکەکـەیەوە هـاتووە .. شانۆکەش وەکو لە سەر پارچە بەردێك هەلّ کەندراوە کـە بە زمانی یۆنانی کۆن نووسراوە ، وا دەردەکـەوێ لە سەردەمی ئەسکەندەری گەورە « دیوسکرایدز » بیناکراوە .

وەکو زانراویشە ئەسکەندەری گەورە کاتی کەوتۆتە ڕێ بۆ شەرکردن دژی فارسەکان ماوەیەك لە بـابل مـاوەتەوە لەو کاتەدا بڕیاری داوە بـە لابردنی خـولێکی زۆر لە دەوروبەری پەرستگاکـانی بابـل ، وەکو پـەرستگای مـەردوخ ، هەر لەو خۆلەش ئەو سێ گردە دروست بووبین کە لە پاشاندا یەکێکیان وەکو شانـۆ ئاوەدان کـراوەتەوە .. لە نـەخشەی شـارەکەدا دەردەکەوێ کە لە شکری ئەسکەندەر بـۆ یاری‌ی وەرزشی‌ی خۆیان‌و رابواردن ئەو شوێنەیان بەکـارهێناوەو ، شـانۆکـەش بریتیە لە ئەلقەیەکی نیو بازنەیی‌و لە شێوەی پایەپایە شوێنی دانیشتنی بینـەران ئامـادەکراوەو لە نێـوانیـانـدا نـۆ ڕێ‌ی هـاتووچـوو دیاری‌کـراوە ، لەسەر هـەندێ شـوێنی بیناکـە « خەتمی » مۆری « نبوخذ نصر » ی مـەلیك دەبینـرێ ، کە ئەوە دەسەلمێنی شانۆکە بەردەوام تازەکراوە ، وە بە تایبەتی لە سەردەمی سلجوقیەکان .

ئەلبەتە بارو زروفی ئەوساو ئالّ‌و گۆڕی ئاووهەوا بوونەتە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆری ئەو بینایە لە نێو چووەو نەماوە ، بە تایبەتی ژوورەکانی ئەم دیوو ئەو دیوی تەختەی سەرەکی کە بۆ ئەکتەران‌و یاری‌کەران تەرخان‌کـراوە ، بەلام مـاوەی چەنـد سالێکە دەستە لێپرسراوەکان خەریکی بیناکردنین .. هەروەها ژوورەکانیش بە تەواوەتی نەدۆزراونەتەوە ، بەلام دیارە کـە هـەموویـان لە درێژی‌و بـەرینی لەیەك نـاچن ، چونکـە پانی دیـوارەکان لە نێـوان « ٩٥ سم ، ١٫١٥ م ، ١٫٢٥ م » ن ، هەروەها پانی دوو دیوارە سەرەکی‌یەکان « ١٫٤٥م » ن ، لە بـەشی سەرووی ڕۆژئـاوا ژوورێکی گەورەیـان لەم دواییەدا دۆزراوەتەوە کە هەر لە ژووری خۆ ئامادەکردنی ئەکتەرەکان دەکات .. بەر لەوەی بێینە سەر تەختەی شـانۆ بـە درێژایی « ١٢٫١٥ م » و پانی « ٩٫٨٠م » ، ئەو شوێنە پایە پایەیەش کـە بۆ دانیشتنی بینـەران دروستکراوە بـریتیە لە سێ چـین یـەکەمیـان : « ٦ » پایـەیەو ، دووەمیـان « ٩ » پـایـەیـەو سێ‌یەمیان : « ١٢ » پایەیەو لە ژێر هەر چینێك ڕێگایەك کراوە بە پانی ١٫٩٢م ، بۆ هاتوو چۆکردن .

بەرامبەر جەماوەرو لە سەر تەختی شانۆ ڕیزێك ئەستون هەیە کـە بریتیـە لە « ١٢ » ئەستـون ، لە نێوان جـەماوەرو تەختەکەیش‌دا دوو ڕێگا هەیە لە ڕاستەوە بۆ چەپ ، بۆ هاتوو چۆی ئەکتەرەکان ، لە هەموو لاکانی شانۆش ژمارەیەکی زۆر ژووری گەورەو بچووك هەن بۆ لێپـرسراوو ئـەندامـانی تیپە هـونەری‌یـەکان ، ئـەگەرچی بـەشێکی ئەو ژوورانـە هێشتا نەدۆزراونەتەوە ، بەلام بە مەزندەی ڕۆژ هەلات‌ناسان دەبێ وابووبێ ، وەك چۆن لە نەخشەکەدا دەردەکەوێ .

● * ● * ●

* ئەم کورتە باسەی سەرەوە پوختەی بـاسێکی فرەوانـە کە نـووسەر پێشکـەشی « کۆلیجی زانستی شـانۆیی » سـەر بە زانکۆی ڤیەنای کردووە ، لە بارەی شانۆ لە عیراقی پێشین‌دا لەسـەر « شانـۆی بابـل » و، لەم چەنـد لاپەڕەیـەدا وەکـو دیـاری‌یەك پێشکـەشی خوێنـەرانی گۆڤـاری « کـاروان » ی دەکات ..

# پێودانگە دراماتیکیو هونەرییەکان

● شەماڵ عومەر ●
ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان
بەغدا / ١٩٨٥

● **پێشەکی : ـ**
ڕابەری شانۆی تەعبیری « ستریندبێرگ » لە نامەیەکیدا کە بۆ « جان پۆل سارتەر » ی نووسیوە دەڵێ : ـ
« خەیاڵی قوڵو مەزن لەدەستەبەرکردنی حەقیقەتدا ، ڕاست گۆیانەترە ، لەو دیاردانەی کە ڕووکەشانە لە واقیعدا خۆیان دەنوێنن ، ئەو ڕووداوە ئاساییانەی کەلەژیانماندا تووشمان دێن ، دانانرێن بەو پێویستیە جەوهەریانەی کە کرۆکی ژیانمان پێك دێنن ، ژیانی منیش هەمووی هەر خەونە » .
جێگای مشتومڕ نییە کەهونەری شانۆ ، وەك جیهانێکی بەرفراوان ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەنگاوی فراوان دەنێتو ، پێشکەوتنو دەسکەوتی مەزن بەدەست دەهێنێ چ لەبواری نووسینی دەقە درامییەکاندا ، یان لەبواری پرۆسیسی دەرهێنانو مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دەقانەدا .
هەرچی لایەنی یەکەمیانە ، زیاتر لەقووڵبوونەوەو شۆڕبوونەوە بەپێودانگە دراماتیکیەکاندا خۆی دەنوێنێتو ، لەهەمان کاتیشدا گەڕانە بەشوێن شێوەو دۆزینەوەی شێوازی تازەدا ، هەروەك « یۆجین ئۆنێل » دەڵێ : **(هەر شانۆیەکی نوێ ، پێویستی بەتان وپۆو شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەیە ، ئەگەر ڕۆژێك وا هاتە بیرمەوە ، کەتەنیا تاکە ڕێکەو شێوازێکم لەبەر دەمایە، ئەو کاتە ئەمە وا دەگەیەنێت کەمن « ئامێر ئاسا » مامەڵە لەگەڵ نووسیندا دەکەم ، ئەمەش شتێکە ڕەتی دەکەمەوە)**

سەبارەت بەلایەنی دووەمیشیان ، واتە لایەنی پرۆسیسی دەرهێنان و مامەڵەکردن لەگەڵ پێودانگە دراماتیکیەکاندا ، لەمەیاندا شانۆی هاوچەرخ ، ئامێزی بۆ گەلێ ڕێبازی تەجریبی کردۆتەوە ، کەبەشێوەیەکی گشتی و لەچوارچێوەیەکی (تەجریبی) دا ، مامەڵە لەگەڵ دەقەکاندا دەکات ، کەئەمەش تێپەڕاندن و بەلاوەنانی ئەو تەکنیکە کۆن و سواوانەیە ، کەلەبواری شانۆی تەقلیدی و واقیعیدا ڕەچاو دەکرێن .

لێرەدا شایەنی باسە کەبڵێین ، هەموو ئەو شێوازە تازانەو ، هەروەها ئەو ڕێبازە تەجریبیانەش ، بەرئەنجامی پشت بەستنە بەو پێودانگە فکریانەی کە سەرچاوەکەیان ئەو حەقیقەتە بنەڕەتیانەن ، کەلەناوەوەی مرۆڤ و ، لەگیان و ، ئارەزوو خواستەکان و ، تێڕوانینەکانیا ، حەشار دراون ، نەك لەو دیاردە « حسی یە دەرەکی یەکاندا ». ئەو تاقیکردنەوانە ، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ، کەسەر لەنوێ ، واقعی دەرەوە دابڕێژرێتەوە ، تاکو لەگەڵ ئەو شتە ناوەکی یە قوڵانەدا بگونجێت و یەکانگیر بێتەوە ، بەشێوەیەك کەپاڵ بەگیانی ئینسانەوە بنێت ، بەرەو بەرزایی بکەوێتە باڵە فرە . کەواتە « تەعبیریەت » وا هاتە پێشێ کە تەعبیر کردن بێت لە نارەزایی مرۆڤ دژی هەموو ئەو کێشانەی کە زەوتکردنی سەربەستی مرۆڤ لە خۆدەگرن ، لە هەمان کاتیشدا دژی هەموو دیاردە ماتەریی یەکانی واقیع بێت ، سەرباری ئەمانەش شانۆی تەعبیری وێنەی ژیانی ناوەکی و خودی مرۆڤ بەرجەستە دەکات ، ئەو ژیانەی کە هەموو شکڵە مردووەکانی سەردەم ڕەت دەکاتەوە و قوڵ تر دەڕوانێ .

جا بۆیە ئەو دەرهێنەرە شانۆیانەی کە خاوەنی تێڕوانینێکی تەعبیری و هاوچەرخن لە شانۆدا ، هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدەن ، کە بیری مرۆڤایەتیانە بە هەموو ئازارو پەشێویی و تێکۆشانی یەکیەوە ، بکەنە تاکە پاڵەوانی ڕاستەقینەی ژیانی هاوچەرخ ، واتە - بە شێوەیەکی ڕوونتر - بیرەمرۆڤایەتی یەکە خۆی لە خۆیدا پاڵەوانی سەرەکی شانۆیی یەکە پێك بهێنێت ،، یان ئەو بیرە لە کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی دا ، کە مرۆڤ تووشی نامۆیی و زەوت کردن و داپچڕان بووە لە حەقیقەتەکان ، ببێتە ئەو پاڵەوانە .

**سەرهەڵدانی « زاراوەی تەعبیری » : -**

کاتێك دەربارەی پەیدابوونی زاراوەی تەعبیری لە جیهانی هونەردا دەدوێین ، خۆمان لەبەردەم گەلێ ڕاو بۆچووندا دەبینینەوە .

هەندێك لەو بڕوایەدان کە (و . ینێجر) ی ڕەخنەگری هونەری ، یەکەمین کەسێکە کە ووشەی تەعبیریی یەتی بەکار هێناوە ، کاتێك دەربارەی تابلۆکانی - (سیزان) ی نیگار کێش دواوە .

هەندێکی تر ڕایان وایە کە بەکار هێنانی ئەم وشەیە ، یەکەمین جار لە لایەن (ئۆتۆتسۆر لێندی) ە وە هێنراوەتە کایەوە ، ئەمەش لە ساڵی « ۱۹۱۱ » داو ، کاتێك لە کۆڕێکی فراوانی ئەدەبیدا ، لە ژێر تیشکی زاراوەی تەعبیریەتدا ، بەرهەمی شیعری کۆمەڵێ شاعیری هەڵسەنگاندووە .

هەر لەم بوارەدا هەندێ لە مێژوو نوسانی ئەدەبی شانۆیی ، سەرهەڵدانی مێژووی ئەدەبی تەعبیری بۆ کۆتایی ساڵەکانی چەرخی نۆزدەیەم دەگێڕنەوە ، بۆ سەلماندنی ڕایەکەشمان ، شانۆگەریی (بە ئاگاهاتنەوەیەکی زوو - اليقظة المبكرة) ی نووسەری شانۆیی ئەڵمانی (فرانك ودکند) دەکەنە نموونەیەکی ئاشکرا کە تیایدا بە شێوەیەکی سادە و سەرەتایی خاسیەت و نیشانەکانی تەعبیریەت ڕەنگیان داوەتەوە ، ئەوەش بەوەی کە نووسەر لە تەکنیکی شانۆنامەکەیدا ، پەنای بردۆتە بەر مەنەلۆژی درێژ و بەکارهێنانی دەمامکی کۆن و ، هەروەها کۆمەڵێ ڕەمزی تەعبیری تر بۆ تەعبیرکردن لە ناخی پاڵەوانەکانی .

هەر سەبارەت بەمێژووی سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیە (ئەریك بنتلی) دەڵێ : - « زاراوەی تەعبیری لە بنەچەدا بەو ڕێبازە دەوترا ، کەکۆمەڵێ نیگارکێش ، بۆ خۆجیاکردنەوە ، لەڕێبازی « انطباعي » گرتیانەبەر » .

هەر لێرەشەوە دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەبکەین ، کەڕووکردنە تەعبیریەت وەکو ڕێبازێکی هونەری و فکری لەساڵی « ۱۹۰۵ » داو پێش ئەم مێژووەش ، لەهونەری نیگارکێشاندا ، وەکو شۆڕشێك بەسەر هونەرمەندانی سەر بە ڕێبازی (انطباعیەت) دەستی پێکرد .



هەر بۆیەشە هونەرمەندە تەعبیریی یەکان ، لە گۆشەنیگای فیکریو هونەری خۆیانەوە ڕووبەرووی ڕێبازی (انطباعیەت) بوونەوە ، بەرپەرچی هونەرمەندانی سەربەو ڕێبازەشیان بەوە دایەوە ، کەگوایە : ـ

**(هونەرمەندی إنطباعي ، مرۆڤێکی سلبی یە ، چونکە بەچاوێکی ڕووت لە شتەکان دەڕوانێ ، لەمەشدا تەنیا ڕووکارو لایەنی ساکاری حەقیقەت بەدی دەکات ، ئەمە لە کاتێدا کە لەسەر هونەرمەند پێویستە لە تێڕوانین و وردبوونەوەیدا ، سنوری ماتەریانەی شتەکان ببڕێتو بەناخی شکڵەکاندا شۆڕ ببێتەوەو هەر بەڕووکەشەوە نەوەستێ تادەگاتە کرۆکی حەقیقەت ، لەم حاڵەتەدا ، هونەری مەزن لە توانایدایە کە بچێتە ناخو قووڵایی خودی ناوەوەی مرۆڤەوە)**

تەعبیریەت بە گرنگترین بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی دادەنرێت کە دژی ڕێبازی تەبیعیو پاشانیش ڕێبازی (إنطباعی) هاتە ئاراوە .

لەسەرەتادا ، تەعبیریەت پابەندی هونەری تەشکیلی بوو ، لەپاشاندا وردە وردە پەلی بۆجیهانی شانۆو شیعرو چیرۆك هاویشت .

شایەنی باسە تەنانەت ئەم زاراوەیە لەپێش جەنگی جیهانی یەکەمدا بەشێوەیەکی فراوان لە مەیدانی شانۆدا لە ئارادا نەبووە ، ئەو شانۆنامانەش کەبەشێوەیەکی سەرەکی خاسیەتی تەعبیریی یەتی تیا بەدی دەکرێت ، لە نێوان سالانی (١٩٠٠ ـ ١٩٢٥) دا نووسراون کە ئەمەش بە سێ قۆناغی تایبەتیدا تێپەڕیوە ، یەکەمیان سەرەتای لە دایك بوونی ، پاشان قۆناغی جەنگی یەکەمو ، دواقۆناغیش دەورووبەری ساڵی (١٩٢٥) ە کە ئەمەی دوایی یان بە قۆناغی پووکانەوە دادەنرێت . دیارترین نووسەرانی سەربەم ڕێبازەش (جۆرج کایزر ، ئارنست تۆلله‌ر) ن لە ئەڵمانیا و (ستریندبێرگ) لە سوید و ، (یۆجین ئۆنێل) لە ئەمەریکادا . بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ئەڵمانیا یەکەم مەڵبەندی بە دیار کەوتنی ئەم ڕێبازە بوو کە ڕاستەوخۆ لە چوارچێوەی دراmadا بە دەرکەوت ، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەڵمانیا لە ژێر باری حوکمی فاشیزمدا دووچاری نەهامەتی و گێرمە وکێشەی ئابووری و ڕایماری بوو بوو ، مەرگ نائومێدی ، ڕوخان ، ترس ، دڵ و گیانی مرۆڤەکانی تەنیبوو .

■ شتێکی ئاشکرایە ، سەر هەڵدانی هەر دیاردەیەکی هونەریی ئەدەبی ، بەبێ بوونی زەمینەیەکی پتەوی فکری و ، بوونی کۆمەڵێك پاڵ پێوەنەری (ذاتی و مەوزوعی) نەش و نما ناکات . هەر لەم ڕوانگەیەشەوە ، کۆمەڵێك هۆکار هەن کە زیاتر بوونە ڕێگە خۆشکەری بەرەو پێش چوونو ڕەگ داکوتانی تەعبیریەت لەوانەش : ـ

(١) نامۆبوونی تەکنەلۆژی (الأغتراب التكنلوجي) : ـ

ئەمەشیان زیاتر بەرئەنجامی زاڵ بوونی ئامێرەکان بوو ، وەك

(هۆیەکانی بەرهەم هێنان) بەسەر لایەنەکانی ژیانی مرۆڤدا ، کە ئەمەش زیاتر ، لە هەست کردنی تاکە کەسەوە بە وون بوون لە نێو کۆمەڵەکەیدا ، بەدیار کەوت .
هەر لێرەشەوە دیاردەی نامۆبوونی کۆمەلایەتی مرۆڤ (الاغتراب الاجتماعي) سەری هەڵدا .
(٢) سەرجەمی تاقی کردنەوەکانی (فرۆید) لە جیهانی سایکۆلۆژیدا .
بە تایبەتی مەسەلەی (لاشعور ـ العقل الباطن) و رادەی دەور بینین و دەسەلاتی ئەم لایەنە لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا ، شتێکی ئاشکرایە تاقی کردنەوەکانی (فرۆید) یەکێك بوون ، لەو کۆڵەکە گرنگانەی کە ڕێبازی تەعبیرییەتی لەسەر بنیات نرا . هەر بۆیە نووسەرانی سەر بەم ڕێبازەش ، زیاتر هەوڵی ئەوەیان ئەدا ، کەبەناخی پاڵەوانی شانۆنامەکانیاندا شۆڕببنەوەو ، تیشکی شیکردنەوەی ئەم حاڵەتە دەروونیانەیان بەرکەوێ .
لەم بارەشدا هونەر بەرەو قوڵایی نەستی (اللاشعور) مرۆڤ ڕۆچوو ، تاکو تیڕوانینی قووڵ بدۆزێتەوە ، لە ڕێگای بەکارهێنانی (ڕەمزو تەجرید) ەوەو ، هەوڵیدا لەواقعی روکەش و سادە دووربکەوێتەوە .
ئەم ڕۆچوون و بەکارهێنانی ڕەمز و تەجریدەش ، وەك دیاردە سەرەکییەکانی تەعبیرییەت ، خۆیان نواند .
پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین ، کە پێشکەوتنی کارەباو کاریگەری زیاتری لە بواری رووناکی شانۆداو ، برەوپێدانی ئەم لایەنە ، ڕۆڵی تەواوی خۆیگێڕا لە خەست کردنەوەو بەدیار خستنی ، جوڵەو بزاوتنی تەعبیرییەتدا ، چونکە بەکارهێنانی رووناکی وەکو لایەنێکی هونەری کاریگەری یەکجار گرنگە لە شانۆگەریی تەعبیریەتدا ، گەلێك جاریش سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی شانۆگەرییەکەی پێوەبەند دەبێت .
■ بە شێوەیەکی گشتی کرۆکی ڕێبازی تەعبیری لە تەعبیرکردن لە خودی مرۆڤ و ، شۆڕبوونەوە بۆجیهانی خەونەکانی و گەران بەشوێن « غەریزە سەرەتاییو ـ بنچینەیەکانیدا) خۆی دەنوێنی .
ڕێبازێکە لەپێناوی کەرامەتی مرۆڤاو ، بەشتە پیرۆزو ڕۆحییەکانیدا ، هەڵدەلێ . هەروەها لەهەوڵدانی بەردەوامایە بۆ گەیشتن بە جەوهەری ژیان و ، تەعبیرکردنێکی ڕاستەقینە ، لە موعاناتو دڵەڕاوکەی مرۆڤ و گەرانی پەیدەرپەی بۆ دۆزینەوەی ماهیەتی ڕۆح و ، پەنجە خستنە سەر گرفت و کێشە دەروونییەکان .
تەعبیرییەکان ، هەوڵیانداوە ، بۆ دەستەبەرکردنی جیهانی بیرو خەیاڵ و خەون . کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەوڵدانە ، بۆ بەرجەستە کردنی شتەکان بەو شێوەیەی کەپێویستە وابێت ، نەك بەو شێوەیەی کەهەیە ، هەروەها بەدیار خستنی مانای شتەکان بەشێوەیەکی قووڵ نەك ساکارو رووکەش . لەبەر ئەوە پەنا دەباتە بەر مەسەلەی (تەجرید و ڕەمز) ، هەموو ئەو جۆرە تەکنیکانە بەلاوە دەنێ و ڕەت دەکاتەوە کەسیماو ناوەڕۆکی گێڕانەوەو لاسایی کردنەوەی واقع بێت هەر بۆیە یەکێك لە دروشمە بەرزەکانی ئەوانەی سەر بەم ڕێبازەبوون ، ئەوە بوو دەیان ووت : ـ
(جیهان لەبەر چاوماندا ، بەڕوونی خۆی دەنوێنێ ، لەبەر ئەوە دووبارە کردنەوەی ئەم جیهانە ، کارێکی دزێوو ناچیزەیە) .
ئەمە سەربارى ئەوەی کە لە شانۆی تەعبیرییدا ، ئامانجی نووسین بەشێوەیەکی سەرەکی ئەوەبوو ، کەسەربەستانە ، تەعبیر لەکەسایەتی مرۆڤ بکات ، نەك بەتەنها پەنا بردنە بەر پرۆسیسی ڕەت کردنەوەی واقع ، بەڵکو لە بواری پەنا بردنە بەر ئەو حەقیقەتەی کە تێی دەڕوانێ و کە پێویستیشە لە پێناویا ، هەوڵ بدات .
پێم وایە کە پێویستە ئاماژە بۆ ئەم خاڵە بکەین ، کەزۆر بیرو ڕاو بۆچوون هەن ، هەوڵ و تەقەللای نوسەرانی سەر بەڕێبازی تەعبیری لە (خانەی) ئەو هەوڵانەدا دادەنێن ، کە نزیکترن لە عەقلیەت زیاتر لەوەی نزیکترین لە ئیجابیەت و چست و چالاکییەوەو ، بانگەشەیەکی ڕاستەقینە بۆ تێکۆشان .
ئەمەش ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە شانۆنامەکانیان کەش و بارو دۆخێکی ڕۆحی و تەسەوفیانە باڵی بەسەردا کێشاون .
■ **بینای درامی لە دەقی شانۆی تەعبیرییدا** : ـ
نووسینی شانۆنامەی (لعبة حلم ـ خەونە یاری) ـلایەن « سترندبێرگ » ەوە ، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەچەسپاندنی تەعبیریەت لەشانۆدا .

مامەڵەکردنی نووسەر لەتەك (کردار - کات - شوێن - ڕووداو - کەسایەتی یەکاندا) ، بەپێی ئەو ڕێبازە تەعبیرییەی کەڕەنگی دابۆوە لای « ستریندبێرگ » بەم شێوەیەیە : -

« ڕووداو ، لەشێوەی خەوندا بەدیار دەکەوێ ، ئەویش بەوەی کردار نامەنتیقیانەیە ، « کات » ، مامەڵەیەکی نیسبیانەی لەتەکدا کراوە « شوێن » نادیاریە ، زنجیرەی ساتە وەختەکان پچڕپچڕە ، « کەسایەتی یەکان » پەرت دەبن ، زیاد دەکەن ، زۆر دەبن دەبنەهەڵم ، چڕدەبنەوە ، بڵاودەبنەوە ، پاشان دەبنەوەیەك . بەلام تەنها یەك هەستی سەرەکی هەیە . کەبەسەر هەموياندا زاڵ دەبێت ، ئەویش هەمان هەستی خەو بینەکەیە (الحالم) سەبارەت بە - خەوبین - مەنتیق بایەخ پێ نەدراوە ، خەوبین - نابێتە بڕیاردەری حوکمی تاوانباری ، یان بێ تاوانی ، تەنیا خەو دەگێڕێتەوەو ، هیچی تر .

- خەونیش - بەوپێیەی زۆر جار جارزکەرەو خۆش نودنی یە ، لەم بارەدا دڵتەنگی و خەمو ئازار تێکەلاوی دەمن ، دەبێتە مایەی دڵتەنگی و خەم خۆریی ، بۆهەموو زیندەوەران و بەزەیی پێداهاتنەوەیان ، هەر لێرەوە ئەو ئازارەی کە خەوبین دەیچێژێ کاتێ دەگاتە لوتکە ، یان چلەپۆپە هەر ئەوسا بەئاگاهاتنەوە دێ بەپیری حەوبینەوە ، تاکو تەبایی و گونجان لەنێوان ئازارچێژو واقیعدا دروستبکات ، ئەو ساش ئازارەکە « هەرچەندە بگاتە ئەوپەڕیشی » دەبێتە شادی ، ئەمەش بەپێوانەکردنی لەگەڵ ئەو خەونە ترسناکەدا » .

ئەمەش نموونە یەکی دیاری دەقی تەعبیرییەو ، ئەو شێوازە تازەیەی ، کە لە ( دەقە واقیعی و کلاسیکی یەکان) بەئاشکرا جیادەکرێتەوە ، بەلام بۆ زیاتر شارەزابوون لەم لایەنە ، باڵیرەوە ، دەروازەیەك بۆ لێدوان لە خاسیەتەکانی دەقێکی درامی ی تەعبیریی بخەینە سەرپشت تا مەبەستە کانمان بە ئاشکرا بدەینە دەستەوە . سەرەتا ، دەبێ ئەوە بڵێین ، کە نووسەری تەعبیری تەنها ناڕوانێتە ڕووکاری شتەکان ، بەڵکو بە قووڵایی (لاشعوردا) شۆڕ دەبێتەوە ، هەر لەو قووڵایی یەشدا ئەرەی ئەو دەیەوێ ، دەستی دەکەوێو ، کونو قوژبنی شاردراوە ، وپێچو پەنا ترسناکەکان تەی دەکاتو ئەو ژیانەی کە بەشێوەیەکی شێتانە پەستێوراوە ، بەدی دەکات . لێرەشەوە ، شێوازێکی تووندوتیژ بەکار دێنێ ، گەرچی هەندێ جاریش هێماو سێبەرو تارمایی لەدوو توێی ئەو شێوازەدا ، دەخاتە ڕوو ، ئەمەش لەکاتی وێنە کێشانی ئەو کەسایەتی یانەی ، کە دووچاری بەشێویی یەکی لەڕادەبەدەری عەقڵی بوونو ، بەرگەی ئازارێکی دەروونی تاڵدەگرن ، لەم خاڵە گرنگەوە ، پەنجە دەخەینە سەر سروشتی « بینای درامی » لەشانۆنامە یەکی تەعبیریداو ، ئەو کۆمەڵە تەکنیکەی کە نووسەرە تەعبیریە کان بەکاری دەهێنن : -

■ ئەگەر درامای کلاسیکی لەسەر « نەخشەیەکی مەنتیقی » بنیات نرابێ ، بەو پێیەی کە هەست بەسەرەتا وناوەڕاستو کۆتایی بکەینو هێڵە سەرەکیەکان بە ئاشکرا خۆیان بنوێننو ئیقاعەکەی سەرەتاو کۆتایی دیاری بکات ، ئەوا درامای تەعبیری بەهەموو شێوەیەك بەپێچەوانەی ئەوەوەیەو ، لەچوارچێوەی بەدوا یەکهاتنی ساتە هەڵچووەکاندا خۆی دەنوێنێ ، نووسەری تەعبیری خۆی لە قەرەی هێڵە سەرەکییەکان نادات ، بەلای ووردو درشتدا « تفاصیل » ناچێ بەڵکو ئەوەی دەیخاتە ڕوو بریتی یە لە زنجیرەیەك مەنەلۆژی چڕوپڕ ، هەندێ جاریش نووسەر قوربانی بەهەندێ ڕووداوی دەرەکی ئەدات ، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەچیرۆکی شانۆنامەکەش .

(١) درامای تەعبیری ، بەهۆی بیرۆکەو ناوەرۆکە ڕێك دەخرێ ، زیاتر لەوەی کە لەڕێگەی ڕووداوو هۆیەکانیەوە بەجێ بگەیەنرێ ، هەر لەبەر ئەوەشە کە لە شانۆی تەعبیرییدا ، کردار دەبێتە شتێکی گەڕۆك ، بەوێستگەکاندا دەگەڕێ بەرەو دۆزینەوەی حەقیقەت ، بۆیە شانۆنامەکە لە کۆمەڵێك شوێنو دیمەن پێكدێت ، کە لە چوارچێوەیاندا پاڵەوان سرەوتی نامێنێ لەدنیای ناوەوەی خۆیدا دێو دەچێو بەدەست کێشەکەوە دەناڵێنێ ، لێرەدا دیمەنە شانۆیی یەکان ، زۆرو جۆراو جۆر دەبن ، هەروەك ڕووداوەکانیش ، بەشێویی و تەمومژ ، لە خۆ دەگرن .

زۆرجار لەدرامای تەعبیرییدا ، دیمەنی سەرەتا (واتە سەرەتای دەست پێکردنی دراماکە) دووبارە دەبێتەوە ، ئەم



دیمەنە سەرەتاییەش ، بەوە لەو دیمەنە جیاجیانەش ، کە شانۆنامەکە پێك دەهێنن ، جیادەکرێتەوە ، کە لەگەڵ ئەوەشدا تان و پۆیەکی واقعیانەی هەیە ، پەیوەندییەکی هەمیشەیی یان بەئاستو لایەنێکی تریشەوە هەیە ، ئەویش ئاستو لایەنی رۆحی یە . ئەمەش خاسیەتێکی تری درامای تەعبیرییە ، کە بەمانای پێشکەشکردنی ئەو دیمەنە شانۆیی یە دێت ، لەدوو ئاستدا یەکێکیان واقیعی ، ئەوی دیکەیان رۆحی یە .

■ **بینای درامی لە دەقی شانۆی تەعبیرییدا : ـ**

نووسینی شانۆنامەی (لعبة حلم ـ خەونە یاری) لەلایەن « سترندبێرگ » ەوە ، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەچەسپاندنی تەعبیریەت لەشانۆدا .

مامەڵەکردنی نووسەر لەتەك (کردار ـ کات ـ شوێن ـ رووداو ـ کەسایەتی یەکاندا) ، بەپێی ئەو رێبازە تەعبیرییەی کەرەنگی دابوەوە لای « سترندبێرگ » بەم شێوەیە : ـ

« رووداو ، لەشێوەی خەوندا بەدیاردەکەوێ ، ئەویش بەوەی کردار نامەنتیقیانەیە ، « کات » ، مامەڵەیەکی نیسبیانەی لەتەکدا کراوە « شوێن » نادیارییە ، زنجیرەی ساتە وەختەکان پچڕپچڕە ، « کەسایەتی یەکان » پەرت دەبن ، زیاد دەکەن ، زۆر دەبن دەبنەهەڵم ، چڕدەبنەوە ، بڵاودەبنەوە ، پاشان دەبنەوەیەك . بەڵام تەنها یەك هەستی سەرەکی هەیە . کەبەسەر هەموویاندا زاڵ دەبێت ، ئەویش هەمان هەستی خەو بینەکەیە (الحالم) سەبارەت بە ـ خەوبین ـ مەنتیق بایەخ پێ نەدراوە ، خەوبین ـ نابێتە بڕیاردەری حوکمی تاوانباری ، یان بێ تاوانی ، تەنیا خەو دەگێڕیتەوەو ، هیچی تر .

ـ خەونیش ـ بەوپێیەی زۆر جار جارزکەرەو خۆش نودنی یە ، لەم بارەدا دڵتەنگی و خەمو ئازار تێکەڵاوی دەمن ، دەبێتە مایەی دڵتەنگی و خەم خۆریی ، بۆهەموو زیندەوەران و بەزەیی پێداهاتنەوەیان ، هەرلێرەوە ئەو ئازارەی کە خەوبین دەیچێژێ کاتێ دەگاتە لوتکە ، یان چڵەپۆپە هەر ئەوسا بەئاگاهاتنەوە دێ بەپیری خەوبینەوە ، تاکو تەبایی و گونجان لەنێوان ئازارچێژو واقیعدا دروستبکات ، ئەو ساش ئازارەکە « هەرچەندە بگاتە ئەوپەڕیشی » دەبێتە شادی ، ئەمەش بەپێوانەکردنی لەگەڵ ئەو خەونە ترسناکەدا » .

ئەمەش نموونە یەکی دیاری دەقی تەعبیرییەو ، ئەو شێوازە تازەیەی ، کە لە ( دەقە واقیعی و کلاسیکی یەکان) بەئاشکرا جیادەکرێتەوە ، بەڵام بۆ زیاتر شارەزابوون لەم لایەنە ، باڵیرەوە ، دەروازەیەك بۆ لێدوان لە خاسیەتەکانی دەقێکی درامی ی تەعبیریی بخەینە سەرپشت تا مەبەستە کانمان بە ئاشکرا بدەینە دەستەوە . سەرەتا ، دەبێ ئەوە بڵێین ، کە نووسەری تەعبیری تەنها ناڕوانێتە رووکاری شتەکان ، بەڵکو بە قووڵایی (لاشعوردا) شۆڕ دەبێتەوە ، هەر لەو قووڵایی یەشدا ئەوەی ئەو دەیەوێ ، دەستی دەکەوێ و ، کونو قوژبنی شاردراوە ، وپێچو پەنا ترسناکەکان تەی دەکاتو ئەو ژیانەی کە بەشێوەیەکی شێتانە پەستێوراوە ، بەدی دەکات . لێرەشەوە ، شێوازێکی توندوتیژ بەکار دێنێ ، گەرچی هەندێ جاریش هێماو سێبەرو تارمایی و تویێ ئەو شێوازەدا ، دەخاتە روو ، ئەمەش لەکاتی وێنە کێشانی ئەو

کەسایەتییانەی ، کە دووچاری بەشێوەیی یەکی لەرادەبەدەری عەقڵی بوون و ، بەرگەی ئازارێکی دەروونی تاڵ دەگرن ، لەم خاڵە گرنگەوە ، پەنجە دەخەینە سەر سروشتی « بینای درامی » لەشانۆنامە یەکی تەعبیریداو ، ئەو کۆمەڵە تەکنیکەی کە نووسەرە تەعبیرییە کان بەکاری دەهێنن : ـ

■ ئەگەر درامای کلاسیکی لەسەر « نەخشەیەکی مەنتیقی » بنیات نرابێ ، بەو پێیەی کە هەست بەسەرەتا وناوەڕاست و کۆتایی بکەین و هێڵە سەرەکییەکان بە ئاشکرا خۆیان بنوێنن و ئیقاعەکەی سەرەتاو کۆتایی دیاری بکات ، ئەوا درامای تەعبیری بەهەموو شێوەیەك بەپێچەوانەی ئەوەوەیە و ، لەچوارچێوەی بەدوا یەکهاتنی ساتە هەڵچووەکاندا خۆی دەنوێنێ ، نووسەری تەعبیری خۆی لە قەرەی هێڵە سەرەکییەکان نادات ، بەلای ووردو درشتدا « تفاصیل » ناچێ بەڵکو ئەوەی دەیخاتە ڕوو بریتییە لە زنجیرەیەك مەنەلۆژی چڕوپڕ ، هەندێ جاریش نووسەر قوربانی بەهەندێ ڕووداوی دەرەکی ئەدات ، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەچیرۆکی شانۆنامەکەش .

(١) درامای تەعبیری ، بەهۆی بیرۆکەو ناوەرۆکە ڕێك دەخرێ ، زیاتر لەوەی کە لەڕێگەی ڕووداوو هۆیەکانیەوە بەجێ بگەیەنرێ ، هەر لەبەر ئەوەشە کە لە شانۆی تەعبیریدا ، کردار دەبێتە شتێکی گەڕۆك ، بەوێستگەکاندا دەگەڕێ بەرەو دۆزینەوەی حەقیقەت ، بۆیە شانۆنامەکە لە کۆمەڵێك شوێن و دیمەن پێك دێت ، کە لە چوارچێوەیاندا پاڵەوان سرەوتی نامێنێ لەدنیای ناوەوەی خۆیدا دێ و دەچێ و بەدەست کێشەکەوە دەناڵێنێ ، لێرەدا دیمەنە شانۆییەکان ، زۆرو جۆراو جۆر دەبن ، هەروەك ڕووداوەکانیش ، بەشێوەیی و تەم ومژ ، لە خۆ دەگرن .

زۆرجار لەدرامای تەعبیرییدا ، دیمەنی سەرەتا (واتە سەرەتای دەست پێکردنی دراماکە) دووبارە دەبێتەوە ، ئەم دیمەنە سەرەتاییەش ، بەوە لەو دیمەنە جیاجیانەش ، کە شانۆنامەکە پێك دەهێنن ، جیادەکرێتەوە ، کە لەگەڵ ئەوەشدا تان و پۆیەکی واقعیانەی هەیە ، پەیوەندییەکی هەمیشەیی یان بەئاست و لایەنێکی تریشەوە هەیە ، ئەویش ئاست و لایەنی ڕۆحییە . ئەمەش خاسیەتێکی تری درامای تەعبیرییە ، کە بەمانای پێشکەش کردنی ئەو دیمەنە شانۆییە دێت ، لەدوو ئاستدا یەکێکیان واقیعی ، ئەوی دیکەیان ڕۆحییە .

**(نووسەرانی شانۆی تەعبیری ئەو تەکنیکەیان بەکار هێناوە ، کە لەسەر تێك و پێکدانی کەسایەتیەکان و کردارە خەیاڵیەکان و قسەی نادیارو ئەو کەسایەتیانەی کە تەرازووی مرۆڤایەتیانەی لاسەنگ بووە ، بەندە ، ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا دەکەن تا بگەنە تەعبیر کردنێکی « توندو تیژ » لە ڕێڕەوی مرۆڤی سەدەی بیستەم و ئەو نامۆیی و دڵە ڕاوکە کۆمەڵایەتیانەی کە دووچاری بوون)**

نووسەرە تەعبیرییەکان لە شانۆنامەکانیاندا پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی گەلێ تەکنیکی جۆربەجۆر ، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوەی تەعبیرێکی ناوەکی بکات ، لەو حاڵەتە دەروونییە جیاجیایانەی ، کە پاڵەوانەکان تیایا دەژین .

بۆ نموونە « یۆجین ئۆنێل » لە شانۆنامەی ( ئیمپراتۆر جۆنز) دا ، دەنگی تەپڵ و جوڵەی بانتۆمایمی بەکار هێناوەو ، لە شانۆکەریی (گۆریلا) دا ، کۆرسی هاوچەرخ و ، لە (براون ـ ی خواوەندی گەورە) دا دەمامکی بەکار هێناوە ، لەگەڵ پەردەیەك بۆ خەلفیەتی مەشهەدەکان ، لە هەر مەشهەدێك ، وێنەیەکی تایبەتی بەرجەستە دەکرێت لەسەر پەردەکە ، پاشان پەنای بردۆتە بەر بەکارهێنانی « تیشکی مانگ » بۆ زیاتر قوڵ بوونەوە لە شەخصیەتی (دیۆن ئەنتۆنی) .

پێویستە لێرەشەوە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەزۆر جار لە شانۆنامەی تەعبیریدا « دەمامك ـ القناع » بەکۆمەڵێك چەمك و دەلالەتی تازەو هاوچەرخەوە بەکار دەهێنرێت ، ئەرکی ئەم دەمامکانەش نواندنی ئەو گۆڕانکاریی و گێرمەو کێشانەیە کە پاڵەوان بەجێی دێنی ، ئەمە سەرباری گۆڕانی بۆ کەسێکی دیکە ، تاکو بۆشمان دەرکەوێ کە چ شتێ ڕۆحیە لە ناوەوەو لە خەلفیەتیشدا ، هەروەها بەرەو ئەودیوی کەسایەتیکەمان دەبات و ئەوەمان پێ نیشان دەدا کەچەشنی خەلفیەتی ئەو تەوژمانەی کە لەگەڵ یەکدا دژوناکۆکن (التیارات المتصارعة) شتێکی تاکی نین ، بەڵکو بەربڵاوو گشتین « یۆجین ئۆنێل » یش ئەمەی سەرەوە زیاتر دەچەسپێنێ و دەڵێ : ـ

زۆربەی زۆری لقەکانی هونەر لەخۆی دەگرێت .
هەر لەبەر ئەوەشە هەوڵی هەڵهێنجانی (استنباط) کۆمەڵێك واتای نوێ دەدا ، لە بواری کۆمەڵێك تەعبیری هونەریی نوێوە ، تەعبیرە هونەرییە نوێیەکانیش ، لە بواری دۆزینەوەی شێوە نوێیەکانی شانۆدا ، بەرجەستە دەکرێت . کە دەشێت ئەم شێوە نوێیانەش ، لە بواری سەربەستی دەرهێنەرەوە بهێنرێنە کایەوە ، ئەو سەربەستی‌یەی کە پێویستە هەبێت ، لە پیاچونەوەو چاوگێڕانەوە ، بەدەقە شانۆیی‌یەکەدا ، لەبەر تیشکی تەفسیری نوێی دەرهێنەردا . تواناو دەسەڵاتی دەرهێنەری تەعبیری ، لە بەڕێوەبردن‌و ئاراستە کردنی کارەکەیدا ، پشت بە خەیاڵی شاعیریانەی خۆی دەبەستێت لە هێنانەکایەی ئەو ، « بەدیلانەی کە جێی ئەو وێنە (صورة) شانۆیی‌یانە دەگرێتەوە کە نووسەر کێشاونی » ، هەروەها لە توانستی خۆی‌دا ، واتە توانای دەرهێنەر ، لە خولقاندن‌و گونجاندنی ئیقاعی‌دا ، لەگەڵ سروشتی دەقەکەدا ، هەروەك ئاشکرایە ، زۆربەی ئەو دەرهێنەرانەی کە خۆیان لە رێبازی تەعبیریدا دەبیننەوە ، بەشێوەیەکی یەکجارەکی ڕووناکەنە دەقی نووسەرە تەعبیرییە هاوچەرخەکان ، بەڵکو زۆر جار مامەڵەش لەگەڵ دەقی تەقلیدی‌و ، واقیعیدا دەکەن ، ئەمەش لەبواروبەپێوانگی ئەو تەفسیرە هاوچەرخانەوەیە ، کە بۆ دەقە تەقلیدیی‌یەکەی دەکەن‌و ، هەر لەو بوارەشەوە ، چارەسەری ئەو کێشانە دەکەن ، کەپێیان دەووترێت « گیانی سەردەم » ، کاتێك ئەم پرۆسیسەش بەئەنجام دەگەیەنن پەنا نابەنە بەر شێواندنی دەقەکە یان بردنە بارێکی تریەوە ، یان وەرگرتن‌و دەست تێوەردانی ، بەڵکو لە گۆشە نیگای ئەو رێبازە تەعبیریی‌یەوە ، مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن ، کە لەپرۆسیسی چارەکردنی دەرهێناندا ، دەیگرنەبەر ، واتا لە تێڕوانینیا ، بۆدیکۆرو جل‌و بەرگ‌و ڕووناکی‌و ، پاشانیش ئاراستەکردنی جوڵەی ئەکتەر و ئەدای ، ئاراستەکردنێکی زانستیانە .
دەرهێنەری سەر بەرێبازی تەعبیری ، هەمیشە ڕوو دەکاتە ئەوەی کە هەست‌و مانا سەرەکی‌یەکانی دراما بەرجەستە بکات ، ئەویش بە بەکارهێنانی هۆیە شانۆیی‌یە جیاجیاکان



(بەکار هێنانی دەمامك ، لە هەندێ جۆری شانۆنامەداو ، بەتایبەتیش ، شانۆنامەی نوێ ، تاکە چارەسەرە بۆ ئەو گیروگرفتەی کە ڕووبەڕووی نووسەری درامای نوێ دەبێتەوە ، بەهۆیەوە دەتوانێ تەعبیر لەو کێشە قووڵ‌و شاراوەیە بکات کە لەمێشکی مرۆڤدا دەخولێتەوە ، ئەو کێشەیەی کە تاکو ئێستاش زانستی دەروونناسی پەردە لە ڕووی هەڵدەماڵێ ـ ئەوەی لە قووڵایی‌و بنکدایە ، بریتی‌یە لە بەدی کردنێکی نوێی سایکۆلۆژیا بۆ شیکردنەوەی « دەردەکەو دەرد لێدراو » لە هەڵس‌و کەوتی مرۆڤدا ـ هەر ئەمەشە کە بەهۆی پۆشینی دەمامك‌و داماڵینی‌یەوە ، تەعبیری لێ‌دەکرێت » .

● کەواتە لێرەوە دەگەینە ئەوەی بڵێین ، کە رێبازی تەعبیری ئارادەیەکی زۆر لە « تیۆری لاسایی کردنەوەی » ئەرستۆیی دوور دەکەوێتەوەو ، وەبەدەئی (تەعبیر کردن لە سۆزو هەڵچوونی هونەرمەند لە کێشەو دژایەتی‌یەکانیدا) جێگەی ئەو تیۆرە دەگرێتەوە ، بەو پێیەی کە تێڕوانینە ذاتی‌یەکان‌و حاڵەتە دەروونیەکان ، شیاوی ئەوەن کە ببنە (بنەچە پرۆژەی داهێنانی هونەری) ـ ئەمە سەرباری شێواندنی واقیع لە رێگەی ئاسان کردن‌و موبالەغەو ووردکردنەوەو ، هەروەها تێکەڵکردنی واقیع بە خەونەوەو بەکارهێنانی ڕەمز ، تاکو ئەو رادەیەی کە هەر تێڕوانینێکی مەوزوعی دەگۆڕێت‌و دەبێ بە تێڕوانینێکی زاتی‌ی زۆر سەر سوڕهێنەرانە .

■ پرۆسیسی چارەسەرکردنی دەرهێنان : ـ

ئێستاکەش دێینە سەر ئەوەی کە بزانین ئامانجی دەرهێنەرانی شانۆی تەعبیری بەشێوەیەکی گشتی چی‌یەو ، چۆن لە بواری رێبازە تایبەتی‌یەکەی خۆیانەوە ، مامەڵەیەکی هونەری لەگەڵ دەقە تەعبیری‌و تەقلیدیی‌یەکاندا دەکەن . دەرهێنەرە تەعبیریی‌یەکان ، لەو بڕوایەدان ، کە شانۆ پێك گەیشتنی

الوسائل المسرحية) ، بەبێ سڵەمینەوە لە ڕووتکردنەوەو التجرید) و ، دوورکەوتنەوە لە واقیع .

ئەو دوورکەوتنەوەیەش هەندێك جار لە پرۆسیسی (شێواندن تشویە) دا خۆی دەنوێنێت ، هەروەك شێواندنی هەر ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی دراما ، لێرەدا پێویستە ، تێبینی ئەوە بکەین ، گەلێ جار شێواندنەکە دێتە سەر ئەو ڕەگەزانەی کە پەیوەندییان بە بینینەوە هەیە ، واتە (العناصر البصرية) ، بەمەش ڕووداوەکان شازو سەرسوڕهێنەر دەبن ، بۆ نموونە : ـ

« دیوارەکان لار دەبنەوە ، کە ئەمەش ئیشارەتە بۆ چەوساندنەوە ، یان درەختەکان دەبنە چەند پەیکەرێکی ئێسکی ، کە دەلالەتە بۆ مردن ، پیاوێك سەری خۆی لە کیسەیەکدا هەڵدەگرێ ، چەند کەسایەتی یەکی ناسراو لە شوێنەکانی خۆیاندا دەرناکەون ، کەسەکان ، بە شێوەیەکی میکانیزمی و ئامێر ئاسا ، دەجوڵێنەوە ، وەك دەلالەتێك بۆ لەکار کەوتنی مرۆڤایەتی ، هەروەها شێواندن لە شێوەو ڕەنگو ئەشدا ڕوو دەدات شتەکان گەورە دەکرێن ، بچووك دەبنەوە ، تاکو ڕادەی زۆر پێوەنان (المبالغة) . ئامانجی دەرهێنەرێکی تەعبیری ئەوەیە کە مەرگەساتەکە ، بگەیەنێتە ئەوپەڕی کاریگەرێتی واتە پلەو ئاستێکی بەرزی (تەعبیر کردن) ببەخشێ بەدەقەکە ، بەشێوەیەك کە ڕاستەوخۆ جەماوەری پێوە پەیوەست بکات . دەرهێنەرە تەعبیریی یەکان ، هەرچی ئەو کەلوپەلە نوێیە شانۆیی یانەی کە یاریدەی خوڵقاندنی هونەریی ئەدەن ، دەخەنە کارو بەکاریان دێنن ، تاکو تەختەی شانۆ لە هەموو لێکچوواندنێکی واقیعی یانە ڕووت کەنەوە ، دوور لە هەموو ڕێڕەوێکی وەسف ئامێزیی ، دوور لە هەموو لاسایی کردنەوەیەك تەنانەت دوور لە هەموو ئیحایەکی واقیعیانەش .

بۆ بەجێهێنانی ئەم کارەش ، واتە پێشکەشکردنی مەرگەساتەکە ، پەنا دەبەنە بەر دوو ڕێگەی سەرەکی : ـ

**(١) ئەدای ناواقیعیانەی ئەکتەر (تەجریدی) .**

**(٢) ڕەمزیەتی هێڵەکان ، شتەکان ، ڕەنگ و ڕووناکی .**

هەروەها دژایەتی یەکی توندو تیژ لە هەندێ ڕەگەزدا ڕوو دەدات وەك ئەوەی دایەلۆژەکان لە پەخشانەوە دەگۆڕێن بۆ شیعر وبە پێچەوانەشەوە ، گوێمان لە بالۆرە دەبێ ، سەرباری ئەمانەش ، دیمەنە واقیعیەکان دیار نامێنن ، تاکو لەبری ئەوان ـ خەونە تێڕوانینەکان ـ بێنە ئاراوە ، کەواتە ئینتیباعێکی سەرتاپاگیری بۆ کارەکە بەدیار دەکەوێت ، ئینتیباعێکی مەجازی وا کە بەرگێکی دێوەزمەیی دەپۆشێ ، کارە تەعبیریی یەکە نوقمی کەش و ئاوو هەوایەکی پڕ لەفەنتازیاو تەلیسمو خەونی ، هەندێ جار ترسناك و هەندێ جاریش دڵخۆشکەر . دەبێت .

دەرهێنەریش بۆ گەیشتن بەمەبەست ، هەوڵ دەدات کە هەر ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی کارە شانۆیی یەکە خۆی لە خۆیدا ببێتە خورپەیەك (صدمة) ، ئەو ڕەگەزانەش ، وەك (ئەکتەر ، دیکۆر ، ڕووناکی ، مۆسیقا) ، بە واتایەکی دیکە ، دەبێ هەریەك لەم ڕەگەزانە ، خۆی لە خۆیدا توانای بەدی هێنانی (چریکەی ڕۆح و ، ڕۆحی سەردەم) ی هەبێت .

**● ئەوانەی ڕەخنە ئاراستەی دەرهێنەرە تەعبیریی یەکان دەکەن ، دەڵێن : ـ**

**« ئەوەی دژایەتی دەخوڵقێنێ ، ئەوەیە کە تەعبیریی یەکان ، تاکو ئەم ڕادەیە ، واقیعی دەرەوەی شتەکان دەنێنە لاوە و ڕەتی دەکەنەوە ، سەرباری ئەمەش پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی ئەو هەموو کەلوپەل لەبەر چاوو بینراوانە) .**

**هەرچی ئەو دەرهێنەرانەشە ، ڕاو وەلامیان وایەکە : ـ**

**« کاتێ ئەوان ئەم شتانە بەکار دێنن ،، بۆ ئەوەنیە کە یارمەتی تەماشاکەر بدەن تاکو بزانێ شوێن و دەوروبەری ڕووداوەکە کامەیە ، هەر وەك واقیعیەکان ، پەنای دەبەنەبەر ، بەڵکو بۆ ڕێگە خۆشکردنی بەردەم تەماشاکەرە تاکو پەیوەستی یەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕووداوەکەدا دروست بکەن کە ئەمەش حەقیقەتی قووڵی دراما پێك دەهێنێ » .**

لێرەوە پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین ، کە تەعبیریی یەت وە نەبێ (شێوازێکی) سەربەخۆ بێت و کۆمەڵێك ڕێ و شوێن و سیمای وای هەبێ ، کە بکرێنە بناغەو پایەیەك بۆ کاری هەموو تەعبیریی یەکان و لەسەری بڕۆن ، هەر وەك کلاسیزمو واقیعیەت و تەبیعیەت ، نەخێر ، بەڵکو ئەوەی خاڵی گرنگە

لێرەدا ئەوەیە ، کە تەعبیریی یەکان هەموو لە ئامانجدا (الغایة) یەك دەگرنەوە ، بەلام لە هۆو شێوازیاندا (الوسائل) جیاوازن ، هۆیەکانیش لە لای هەر یەکێکیان بەسە بۆ ئەوەی کە بگەنە ئەو حەقیقەتەی کە هەموویان لەسەری یەك دەکەون ، ئەویش [ دڵەڕاوکەی مرۆڤ ، نامۆبوون ، چریکەی ڕۆح ] ە .

لەگەڵ ئەوەشدا کە باوەڕ بەوە دەهێنین کە دەرهێنانی شانۆی تەعبیری نەبۆتە مەنهەجێك ، یان شێوازێك بەقەدەر ئەوەی تەعبیرکردنە لە لەخرەی داشکانەوەی ویژدانی هونەرمەندو گیانی سەردەم لەتەك ئەوەشدا ، وەك دیاردەیەك ڕێ‌و شوێنی دیاریکراوی خۆی هەیە لە مێژووی کۆمەڵگای ئەوروپایی‌و لە مێژووی شانۆدا لە چەرخی بیستەمدا .

■ **لایەنە هونەرییەکانی تر لە شانۆی تەعبیریدا : ـ**

● ● **نەخشە کێشانی دیکۆر : ـ**

سەبارەت بە نەخشە کێشانی دیکۆریش ، لە شانۆیەکی تەعبیریدا ، هەروەك وتمان ئامانجی سەرەکی لایەنە هونەرییەکانی تەعبیریەت بریتی‌یە لە دابڕبوون لە شکلە واقیعی‌یەکان‌و پەنا بردنە بەر تەجرید ـ دیکۆریش بەو پێ‌یەی یەکێکە لەو هۆیانەی کە ئەم (تەجریدە) بە تەواوی دەیگرێتەوە ، کەواتە پێویستە نەخشەکێشی دیکۆر ، هەوڵی خولقاندنی دەوروبەرێکی مێژوویی‌و دەستنیشانکراو لە چوار چێوەی نەخشە کێشانی دیکۆرەکەیدا نەدات ، یان بارودۆخێکی کۆمەلایەتی و دەستنیشانکراو و ڕاستەقینە نەڕەخسێنێ کەواتە نەخشەکێشی دیکۆر لە بیر کردنەوەی خۆیدا بەهەموو شێوەیەك بۆ دروستکردنی دیکۆر پەنا دەباتە بەر هەموو ئەو شتانەی کەدوورن لەوەی هێمای نزیکی شتەکە دەدەن لە واقیعەوە « بۆ نموونە یەکێك لە دەرهێنەرە تەعبیریی یە ئەڵمانیەکان لە شانۆنامەیەکدا ، هەموو دیکۆری شانۆنامەکەی بریتی بووە لە قوماشی پرتەقاڵی و بنەوشەیی ، ئەکتەرەکان باڕۆکەی سەوزو سووریان لەسەر ناوە ، مامەڵەیان بەشێوەیەك لە تەك ئەو قوماشەدا کردووە ، کە کۆمەڵێك تەعبیری ناو شانۆنامەکە بداتە ددستەوە » .

هەرودها سەباردت بەو هۆیە تەشکیلی و تەعبیرییانەی کە بەکار ددهێنرێن . لە مەیاندا ناتوانین بڵێین پێویستە ئەم تەشکیلە وا بەکار بهێنرێت‌و ئەو هۆیە تەعبیریی یە شێوەیەکی وا لە خۆبگرێت ، بەواتایەکی تر هۆیە تەشکیلی‌و تەعبیریی یەکان شوێنی بەکارهێنانێکی گشتی وایان نیە کە هەموان پەیڕەوی بکەن ، بەڵکو لە دەرهێنەرێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت ، ئەمەش بەرەنجامی تێڕوانینی تایبەتی‌و خەیاڵی شاعیرییانەی خۆیانە ، واتە بەرجەستەکردنی هۆ شانۆیی یەکان ، پەیوەستە بە خودی دەرهێنەرەوەو ، هەروەها بەو پەیوەندیی یە فکری‌و ویژدانی یەی کە دەیبەستێتەوە بە سەردەم‌و کێشەکانی یەوە .

بەلام لێرەدا نابێ ئەو خاڵە لە بیر بکەین کە دیکۆری شانۆنامەیەکی تەعبیری لە تەوەرەیەکی سەرەکیدا دەسووڕێتەوە ، ئەویش بەوەی کە هێڵەکان لارو چەماوەن لەبری ئەوەی ڕاست‌و ڕێکبن ، ڕەگەزەکان ناتەواوو تێك شکاوون ، هەروەها ناڕێکی‌و لەیەك نەچوونێکی بە ئانقەست بەدی دەکرێت .

بە شێوەیەکی گشتی دیکۆری شانۆنامەیەکی تەعبیری لەوە تێپەڕ ناکات ، کە بۆشایی یەکی شانۆیی بڕەخسێنێ‌و تەواوکردن‌و پڕکردنەوەی ئەم بۆشایی‌یەش بەکاری ئەکتەرو تیشکی ڕووناکی‌و مێشکی تەماشاکەر پڕدەکرێتەوە .

هەروەها پێویستە دیکۆر ئەمەندە خزمەتی دیمەنەکان بکات ، بەڕادەیەك کە لە خەونێکی ناخۆش‌و بزوێنەر بچێت .

● لێرەدا ئەوەی کە ماوە باسی لێوە بکەین مەسەلەی ڕووناکی و ئەکتەرو مۆسیقایە ، سەبارەت بە « ڕووناکی لە شانۆی تەعبیریدا » ، زۆرجار ڕووناکی بۆ مەبەستی توندو تیژکردنی ئەو گرژی‌و تێکچڕانە بەکار دەهێنرێت کە بارو دۆخەکە پێویستە بیگرینەخۆ .

ڕووناکی لە کارێکی تەعبیریدا ، ڕووناکیەکی گشتی نی‌یە ، واتە سەرتاپای شانۆ بگرێتەوە ، بەقەدەر ئەوەی ئاڕاستەی هەندێ شوێن‌و ناوچە دەکرێت ، بە شێوەیەك ئەکتەر بە تەواوی لە دەوروبەرەکەی دابماڵرێ‌و ، پەیوەندیی یەکانی بەجیهانی دەرەوەو کەسایەتی یەکانی ترەوە بپچڕێنرێ .

لێرەدا گەرچی ڕووناکی بەهێزیش بێت ، بەلام چڕو دیاریکراوەو مەناخێکی ڕەمزی و ترسناك ددرەخسێنێ .

**ڕووناکی شانۆ لەلای تەعبیریی یەکان . هاوتاو هاوکێشی دیمەنە**

شانۆیی‌یه ـ کانه ، ڕووناکی لێره‌دا په‌یوه‌ندیی‌و تێکچوونی نێوان که‌سایه‌تی‌یه‌کان ده‌خولقێنێ‌و ، شوێن ڕووداوه‌کان ده‌که‌وێت ، نه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی وه‌سفیان بکات ، به‌ڵکو بۆ ئه‌وه‌ی له قۆناغه جیاجیاکانیدا ، ته‌فسیریان بکات .

که‌واته ، ڕووناکی ته‌عبیریی ، خه‌یاڵ ده‌بزوێنێ و ته‌عبیر له هه‌ڵچوونی پاڵه‌وانه‌کان ده‌کات‌و یاریده‌ی به‌دیار خستنی باروده‌خی خه‌ون‌و تارمایی‌یه‌کان ده‌دات ، ئه‌مه سه‌رباری هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی که له ناو ده‌روونی مرۆڤداو له پێناوی ناره‌زایی ده‌ربڕیندا ده‌رده‌که‌ون .

■ **ده‌رباره‌ی « ئه‌کته‌ر » یش ، به گشتی ده‌توانین بڵێین : ـ**

« بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌کته‌ر له به‌رده‌م ئیراده‌ی نوێی هونه‌ردا ڕابوه‌ستێ ، پێویسته به ته‌واوی ڕزگاری بێت له واقیعی ڕووکه‌ش‌و هه‌موو ئه‌و باره ڕۆتینانه‌ی ژیان ، هه‌تا بتوانێت ببێته هه‌ڵگری فکرو قه‌ده‌ر » .

که‌واته ئه‌کته‌ری شانۆی ته‌عبیری هه‌ڵگری فکره ، زیاتر له‌وه‌ی شیکه‌ره‌وه‌یه‌ك بێت ، (واته بۆ فکره‌که) .

لێره‌دا . ئه‌دای ته‌عبیریی پێویستی به ووردی‌و چڕبوونه‌وه‌و ، ڕه‌مز هه‌یه ، هه‌روه‌ها پێویستی به کۆششێکی بێ‌پایان هه‌یه ، تاکو ته‌رجه‌مه‌یه‌کی خه‌ست‌و خۆڵی حه‌قیقه‌تی چنگ که‌وێ ، له‌م بواره‌دا ئه‌دایه‌کی چڕی تێکه‌ڵاو ، به‌بارگه‌یه‌کی هه‌ڵچوونی به‌رزی هه‌ندێ جار ، شاعیریانه‌وه ، هه‌ندێك جاریش نوقم‌بوون له هات‌وهاوارێکی زیاد له پێویستدا ، به‌کاردێنی ، هه‌ر لێره‌شه‌وه ، سیفاتی گرژی‌و په‌ستی‌و هه‌ڵچوون زاڵ ده‌بێ به‌سه‌ر جووڵه‌دا ، که ئه‌مه‌ش بۆ ته‌عبیر کردنه له‌بوونی گێرمه‌و کێشه‌و گیروگرفت .

ته‌عبیریه‌ت ، فیکره‌ی ئه‌کته‌ر به‌و شێوه‌یه‌ی که پاڵه‌وانێکی تراژیدی بێت ڕه‌ت ده‌کاته‌وه ، یان ئه‌کته‌ر به‌و مه‌به‌سته‌ی که که‌سایه‌تیه‌کی دیاریکراو بێت و به‌رجه‌سته‌ی بکات ، که‌واته ته‌عبیریه‌ت ئه‌وه‌ی له ئه‌کته‌ر ده‌وێ که حاڵه‌ته‌کانی ڕۆح ته‌رجه‌مه بکات . له‌م ناوه‌شدا ، بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌کته‌ر ئه‌وه به‌دی بهێنێ ، پێویسته ئه‌داکه‌ی به پله‌ی یه‌که‌م (فیزیکی بێت) . هه‌ر بۆیه‌شه ئه‌دای ته‌عبیریانه ، بنه‌مای زۆن بووی جه‌سته‌ی زیندوو کرده‌وه‌و ، گوڕو تینی پێ‌به‌خشی ، به شێوه‌یه‌ك که ته‌عبیر ، له قۆناغه‌کانی دراما بکات و له هه‌ڵچوون و داچوونی ناخی که‌سایه‌تی‌یه‌که .

ده‌شێ ته‌ماشاکردنی سه‌مایه‌کی ته‌عبیری ئه‌وه‌مان بۆ بره‌خسێنێ که له زمانی ئه‌و جووڵه و بزووتنه‌وانه بگه‌ین ، که ئه‌کته‌رێکی ته‌عبیری له کاتی ئه‌داکه‌یدا به‌جێی دێنێ ، چونکه ئه‌مه نزیکه له‌وه‌وه‌ی که سه‌ماکه‌رێك به‌هۆی هه‌ر ماسولکه‌یه‌کی له‌شیه‌وه ته‌عبیر له واتای سه‌ماکه‌ی ده‌کات . که‌واته پێویسته له‌شی ئه‌کته‌ر ، ئاماده بێت بۆ به‌رجه‌سته‌کردنی حاڵه‌ته ڕۆحی‌یه‌کان‌و هاوتاو گونجاوبێت ، به‌ڕاده‌یه‌ك ، تاکو بگاته ته‌رجه‌مه‌یه‌کی بێ پێچ‌و په‌نای ئه‌و حاڵه‌ته .

● هه‌رچی ده‌رباره‌ی مۆسیقاشه ، ئه‌مه‌نده هه‌یه بڵێین ، مۆسیقا به‌کار ده‌هێنرێت بۆ به‌رجه‌سته‌کردنی حاڵه‌ته‌کان ڕاسته‌وخۆ ، مۆسیقایه‌ك که ته‌عبیر له هه‌ڵچوونی پاڵه‌وان بکات ، ئه‌مه سه‌رباری ئه‌و هۆو کارتێکه‌ره ده‌نگیانه‌ی (المؤثرات الصوتية) که قووڵی ئه‌م هه‌ڵچوونانه بۆته‌ماشاکه‌ر به‌دیار ده‌خه‌ن‌و ده‌یچه‌سپێنن .

● سه‌رچاوه‌کان : ـ

(١) شانۆنامه‌ی (خه‌ونه یاری ـ لعبة حلم) له مانگی نیسانی ١٩٨٥ دا وه‌ك کارێکی ته‌جریبی له به‌شی شانۆی ئه‌کادیمیایی هونه‌ره جوانه‌کانی به‌غدا پێشکه‌ش کرا بۆ ماوه‌ی پانزه ڕۆژ له ده‌رهێنانی مامۆستای هونه‌رمه‌ند « شفيق المهدي » دا ، به‌و پێ‌یه‌ی که خۆم یه‌کێك بووم ، له به‌شدارانی شانۆنامه‌ی ناوبراو ، له‌م باسه‌مدا وه‌ك به‌رهه‌مێکی ته‌جریبی له‌به‌رچاوی سه‌ر به ڕێبازی ته‌عبیری سوودم لێ وه‌رگرتووه .

(٢) شانۆنامه ته‌عبیریی‌یه‌کانی « یۆجین ئۆنێل » : ـ

أ ـ ئیمپراتۆر جۆنز .

ب ـ غۆریلا .

جـ ـ براونی خواوه‌ندی گه‌وره .

(٣) شانۆنامه ته‌عبیریی‌یه‌کانی (ئۆجست سترنبرگ) : ـ

أ ـ خه‌ونه یاری .

ب ـ سێینه‌ی « ڕێگای به‌ره‌و دیمه‌شق »

# ڕوونکردنەوە

١ ـ لە ژمارە « ٣٧ » ی گۆڤارەکەماندا وێنەی بەرگی دووەم بەناوی کاك هیوا قادر بڵاوبۆتەوە ، کە لەڕاستیدا هی خوشکی هونەرمەند « نظیرە عبداللە » یە ، داوای لێبووردن دەخوازین .

٢ ـ لە ژمارە « ٣٦ » ی گۆڤارەکەماندا ، چەند هەڵەیەکی چاپ کەوتبوونە نێو بابەتەکەی مامۆستا جەلال تەقی ، کە بەناونیشانی « ئاسمانی پڕ لە نهێنی » بوو ، لە لاپەرە « ٨١ ـ ٩٢ » دا بڵاوبیووەوە ، وە بۆ ئەوەی خوێنەرە ئازیزەکانمان چاکتر لە ناوەرۆکی بابەتەکە حاڵیبین وامان بەچاك زانی دەقی ئەو هەڵانەی چاپ دووبارە بڵاوبکەینەوە کەوا لەخوارەوە دەستنیشانمان کردوون ..

| لاپەرە | ستوون | دێڕ | هەڵە | ڕاست |
|---|---|---|---|---|
| ٨٧ | ١ | ٨ | ٣٩٢٦٠ | ٣,٢٦٠ |
| ٨٧ | ١ | ١٠ | ١٩٣ | ١,٣٠ |
| ٨٧ | ١ | ١١ | ٤٩٢٣ | ٤,٢٣ |
| ٨٧ | ١ | ٢٣ | ٣٩٩٩٧٣٩٥=٩٤٠×٤٩٢٣ | ٣٩٩٩٧,٥ = ٩٤٠×٤,٢٣ |
| ٨٧ | ٢ | ٣٢ | ٣٩٢٦ | ٣,٢٦ |
| ٨٨ | ١ | ٢ | ٤٩٢٣ | ٤,٢٣ |
| ٨٨ | ١ | ٣ | ٣٩٩٩٧٣٩٥ | ٣٩٩٩٧,٥ |
| ٨٩ | ٢ | ٢٠ | ١... ... ... | ١... ... ... ... ... .../٨ |
| ٨٩ | ٢ | ٢٣ | ١... ... | ١... ... ... .../١ |
| ٩٠ | ١ | ١٠ | ١٩٦٧ | ١,٦٧ |
| ٩٠ | ١ | ١٩ | ١٩٨٦ | ١,٨٦ |
| ٩٠ | ١ | ٢٣ | ١٨٩٦ | ١٨,٦ |
| ٩٠ | ١ | ٣٢ | ٤٩١٧ | ٣,١٧ |
| ٩٠ | ٢ | ١٥ | ٣,٦٩ | ٣١٦٩٠ |

زانیاری

# ئینسکل

(بەشی یەکەم)

« A man may know the world without Leaving his own home »

(Lao-tzo) (دەشێت کە مرۆڤ لە جیهان بگات بەبێ ئەوەی کە لە ماڵی خۆشیان دوور بکەوێتەوە) (لاوتزۆ) ئا بەم چەند وتە نایابە (ئەتلەسی جیهانی نموونەیی ڕاند مەکناڵی Rand Mcnally-Standard World Atlas دەست پێدەکات و کۆتایی دێت ، واتا مەرج نییە مرۆڤ هەر بە گەشت و گەڕان لە جیهان بگات ، بەڵکو دەشێت بە ڕێگەی کتێب و فەرهەنگ و سینەماو تەلەفیزیۆن .. هتد گەلێك شت دەربارەی نهێنییەکانی جیهان بزانێت .

## ١ ـ ئینسکلۆپیدیا لە مێژوودا[1] :

### مانای ئینسکلۆپیدیا واتا بازنەی زانستییەکان

(الموسوعة = دائرة معارف = Encyclopaedia encyclopedia+ The circle of knowledyes) فەرهەنگێکی فراوان دەگرێتەوە ، زیاتر لە دوو هەزار ساڵ دەبێت کە ئینسکلۆپیدیا وەکو کورتەیەکی (مختصر) زانستی بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەبووە کە خوێنەران بتوانن تێی بگەن . وشەی (زاراوەی) ئینسکلۆپیدیا بنچینەیەکی گریکی (اغریقي = Greek) هەیە بەم جۆرە

# ـسۆپیدیا لە مێژوودا

**کۆڕین و ئامادەکردنی**
**کەمال جەلال غەریب**

ـووسراوە . (Enkyklopaidia) کە لەوکاتەدا مانای (بازنەیەك یان ـژێمێك یان پرۆژەیەکی تەواوی بۆ فێربوون) گرتۆتەوە . واتا بە مانای ڕۆشنبیری یەکی تەواو ، یان هەر دانراوێك (کتێبێك) لە لاپەڕەی یەکەمەوە بۆ دوا لاپەڕە ڕاستی ی ئەوتۆی تێدابێت کە ـە مەودای بازنـەی زانیاریی مـرۆڤدابێت . بـۆ نموونـە : لە

هەندێك ئینسکلۆپیدیادا باسێکی دوورو درێژ دەربارەی ولاتی مەکسیك هەیە رابیلە[2] بۆ یەکەم جار ئەم زاراوەیەی لە زمانی فەرەنسیدا لە کتێبی پانتاگرویل (Pantagruel) دا ، سالی ١٥٣٢ لە بەندی (٢٠) هەمدا بەکارهێناوە . پاوڵ سکالیچ (Paul Scalich) کە نووسەرێك و دانەرێکی ئەلمانی بووە ، یەکەم کەس بووە کە ئەم وشەیەی کردووە بە نازناوێك بـۆ کتیبەکـەی کە لە سـالی ١٥٥٩ دا بلاوی کردۆتەوە . ئەو چەندەها کتێبانەی کە بەر لەم وەختەدا بلاوکراونەتەوە ناوێکی خەیالییان لێ نراوە وەکوو ناوی باغچەی خۆشی یەکان (حدیقـة الأفراح = Garden of Delights) یان بە شێوەیەکی ساکار ناوی فەرهەنگیان (قاموس = معجم Dictionary)[3] لێنـراوە ، بـەلام لە ڕاسـتـیـدا ئـەوانـە ئینسکلۆپیدیابوون . بەکارهێنانی وشەی ئینسکلۆپیدیا لە لایەن پێشەنگ (رائد Pioneer) پاوڵ سکالیچەوە ، ئەوساکـە ، جێی ڕەزامەندی گشتی نەبووە . هەتاوەکو (دێنیس دیدرۆ = Denis Diderot)[4] لە ئینسکلۆپیدیا فەرەنسی یە مێژوویی یەکەیدا کردی بـە وشەیـەکی بـاو ، هـەرچـەنـدە کـە ئـەوسـاکـە وشـەی (سایکلۆپیدیا = Cyclopaedia) لەجیاتی ئینسکلۆپیدیا باوبووە ، تەنانەت هەتاوەکو ئیمڕۆش ئینسکلۆپیدیای تازە ، واتا هی ئەم سەردەمە ، هەر بە هـەلە پێی دەوترێت فـەرهەنـگ . بەلام دەبێت ئـەوەش بزانـین کە هیـچ فەرهـەنگێکی باشیش پێی نەوتراوە ئینسکلۆپیدیا . مانای وشەی ئینسکلۆپیدیا لە ماوەی مێـژووە دوورو درێژەکـەیدا هـەتـا ڕادەیـەکی زۆر گـۆڕانی بەسەردا هاتووە ، بەلام ئیمڕۆ زۆربەی زۆری خەلکی وایان بە خەیالدا دێت کە ئینسکلۆپیدیا بریتی بێت لە کتێبێکی (یان چەند کتێبێکی) چەندینە بەرگی ئەوتۆ کە کورتـەیەکی بـە سوودی دەربارەی هەموو جۆرەکانی زانست (یان لقێکی زانست) تێدا بێت ← نەخشـە (خریطة = Map) و پێـرستی (فهرست = index) دوورو درێژو چەندەها پاشکۆی (مـلاحق = adjuncts) وەکوو لیستەی ناوی سەرچاوەی کتێبەکـان = بیبلیۆگـرافی (بـیبلوغـرافی = bibliography) و ڕاڤـە (شـرح) و وێنـەی ڕوونکەرەوە (صور توضیحیة = illustrations) و وێنەی هێلکاری (رسـم تـخـطیـطی = diagram) و لیـسـتـەی کـورتـەی

(مختصرات = abbbreviations) دەربرینە (تعابیر) بیانی یەکان و فەرهەنگی جوگرافیا (معجم جغرافي = Gazetteer) یان (Geog- raphical dictionary) .. هتد تێدابێت .

هەروەها وای چاوەڕوان لێدەکرێت کە مێژووی ژیانی مرۆڤە بە ناوبانگەکانی سەردەمە کۆن و تازەکانیشی تێدابێت و ناوەرۆکەکەی (محتویات = متن) بە پێی پیتی ئەلف و بێی (أبجدیاً = Alphabetically) ئەو زمانە تایبەتی یە ریزکرابن و لە لایەن چەند زانایەکەوە دانرابێت و لە لایەن دەستەیەکی شارەزاو رۆشنبیرو زاناشەوە چاپکرابێت . لە گەڵ ئەوەشدا هیچ کامێك لەم ئینسکلۆپیدیایانە هیچ بەشێك لە بەشەکانیان بە تێپەڕبوونی کات وەکو خۆیان نەماونەتەوە ، ئینسکلۆپیدیا بە گەلێك قەبارە هەیە . بۆ نموونە بەرگێکی (جزء) تەنها (٢٠٠) لاپەرەیی وە کە دەشێت لە لایەن یەك کەسەوە دانرابێت بۆ قەبارەیەکی مەزنی وەکوو (١٠٠) بەرگی یان زیاتر . پلەی (رادەی) ئەو زانستی یەش کە بڕیار دەدرێت تیایدا بێت بە پێی وەخت و جۆری ئەو وڵاتە دەگۆڕێت کە تیایدا ئینسکلۆپیدیاکە چاپ دەکرێت و بڵاودەکرێتەوە . چەندەها ئینسکلۆپیدیا هەن کە راڤەو ئەتڵەس (أطلس = مصور جغرافي Atlas) واتا کۆمەڵە نەخشەی جو غرفیای بەرگ تێگیراوو لیستەی ناوی سەرچاوەی کتێبەکانیان تێدانیە . بۆ ماوەیەکی دوورو درێژیش باوەڕوابوو کە نابێت ئینسکلۆپیدیا ناوو مێژووی ژیانی مرۆڤە بەناوبانگەکانی تێدابێت . تەنانەت پێرستیش (فهرست) لەم دوایی یەدا خراوەتە سەر ئینسکلۆپیدیا . دەتوانین بڵێین کە زوربەی ئینسکلۆپیدیا کۆنەکان سوودێکی ئەوتۆیان نەبووە . بەمانا کۆنەکەیدا وشەی ئینسکلۆپیدیا وای لێ چاوەڕوان دەکرێت کە نەوەك هەر ئەوئینسکلۆپیدیا گەورە کۆن و تازانە بگرێتەوە بەڵکو هەموو ئەو کارانەی (بەرهەمانەی) کە پێویست بەوە دەکات لەسەر هەموو بابەتێك ، یان چەند کۆمەڵە بابەتێك زانستی یەکی باش کۆبکەنەوەو رێکیان بخەن : ئەمە ئەو فەرهەنگە بچووکانەش دەگرێتەوە کە تایبەتین بە فەلسەفەو مێژووەوە ، جگە لە کتێبی وەکوو ساڵنامەی جیهانی (التقویم العالمي = The World Almanac)(°) کە لە راستیدا جۆرێکە لە ئینسکلۆپیدیاو لێشاوێکی زانستی تێدایە . هەروەها جیاوازیشە لە ساڵنامە (تقویم = Calendar) یان کتێبی ساڵانە (الکتاب السنوي = الحولیة year book) کە بریتییە لە کتێبێك یان نامیلکەیەك ساڵانە بڵاودەکرێتەوەو زانستی و هەڵژماریی (إحصائیات) دەربارەی ئەو ساڵە تێدایە چونکە ساڵنامە یان کتێبی ساڵانە تەنها ئەو رووداوانەی تێدا تۆمارکراوە کە تازەن، جگە لەوەی ناوبەناو دەردەکرێت ، بە پێچەوانەی ئینسکلۆپیدیاوە کە دەشێت رووداوی ئەوتوشی تێدابێت کە لە دێرزەمانەوە هاتوون سەرەڕای ئەوەش کە بەشێوەی یەکەیەکی (وحدة) تەواودەردەکرێت ، واتا بڵاودەکرێتەوە . دەتوانین بڵێین کە کورتەی مەبەست و مێژووی ئینسکلۆپیدیا ، بە شێوەیەکی سەرەکی رابەرێکە بۆ مێژووی گەشەکردنی زانیاریی ، چونکە ئینسکلۆپیدیاکان وەکوو نیشانەی سەرەڕێ (رێنما) وان ئەو زانیارییانەمان بۆ دەستنیشان دەکەن کە لە کاتی چاپکردن و بڵاوکردنەوەیاندا باون ، زۆرماڵ و نووسینگە (مکتب) هەن کە هیچ جورە ئینسکلۆپیدیایەکیان تێدانیەو کەمێکیش هەن کە لە ئینسکلۆپیدیایەك زیاتریان تێدابێت .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین کە بەر لە (٢٠٠٠) ساڵەوە هەتا ئێستا نزیکەی (٢٠٠٠) ئینسکلۆپیدیا لە وڵاتە جیاوازەکانی جیهاندا دانراون و بڵاوکراونەتەوەو هەندێکیش لەمانە چەندەها جار سەرلەنوێ لە چاپدراونەتەوەو هیچ کتێبخانەیەکی گشتیش نیە کە دانەیەکی لە هەریەکێك لەمانە تێدابێت ، ئەگەر رێك بکەوتایەو هەموو ئەو ئینسکلۆپیدیایانەی کە هەتا ئێستا چاپکراون بەریز لە تەنیشت یەکتری یەوە دابنرابانایە ئەوا لە رەفەیەکی ئەوتۆدا جێگەیان دەبوو کە نزیکەی (٢) میل درێژبێت ، بەڵام هەموشیان پێویستی یان بە پاراستن هەیە ، تەنانەت ئەوانەشیان کە مۆدێلەکانیان کۆنە ، چونکە ئەمانەش گەلێك وتارو باسی ئەوتۆیان تێدایە کە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە پێشەواو زانایانەوە نووسراون . ئەم بەندە بەم جۆرەی خوارەوە کورت دەکەینەوە .

١ ـ نەژادی (بنچینەی) ئینسكلۆپیدیاكان .

٢ ـ ئینسكلۆپیدیاكان بەشێوەیەكی گشتی : ڕۆڵی (دەوری) ئینسكلۆپیدیاكان ، چاپكردن و بڵاوكردنەوەیان .

٣ ـ جۆرەكانی ئینسكلۆپیدیا : ئینسكلۆپیدیا گشتییەكان ، فەرهەنگە ئینسكلۆپیدیاییەكان، ئینسكلۆپیدیای تازە ، ئینسكلۆپیدیا بۆ مەبەستی تایبەتی ، ئینسكلۆپیدیای مندالان ، ئینسكلۆپیدیا پسپۆڕییەكان ، ئینسكلۆپیدیای وڵاتان و ناوچەكان .

٤ ـ مێژووی ئینسكلۆپیدیا : ئینسكلۆپیدیا لە خۆرئاوادا ، ئینسكلۆپیدیا لە خۆرهەڵاتدا ، مەبەست و كاری ئینسكلۆپیدیاكان .

## ١ ـ نەژادو سروشتی ئینسكلۆپیدیاكان :

ئاوێنەی مەزنتر (المرآة العظمى Speculum majus) واتا (The Greater mirror) كە لە ساڵی ١٢٤٤ زایینیدا تەواوبووە یەكێكە لە گرنگترینی هەموو ئینسكلۆپیدیاكان ، دانەرەكەی سورە لەسەر ئەوەی كە نەك هەردەبێت ئەم بەرهەمە بخوێنرێت بەڵكو دەبێت ئەو بیروڕایەشی كە تیایەتی بنرێتە دڵەوەو خەڵكی لەسەری برۆن . بەپێی مانای دووەمی وشەی ئاوێنە (mirror = speculum) دانەرەكە ئەوە دەردەخات كە جیهان چییەو دەبێ چۆن بێت . بەشداربوونی ئینسكلۆپیدیا ، بە شێوەیەكی گرنگ لە پێشخستنی ئادەمیزاددا لە مێژووە . درێژەكەی مرۆڤدا هەمیشە دووبارە دەبێتەوە ، فەیلەسوف (ڕامۆن = Ramon) وای دادەنێت كە ئینسكلۆپیدیاكانی سەدەی (١٣) هەم پێكەوە لە گەڵ زمان (اللغة = Language) و ڕێزماندا (قواعد اللغة = Grammars) چەند هۆیەكن بۆ گەڕان بە شوێن ڕاستیدا . دۆمنیكۆ باندینی Domenico Bandini كە مرۆڤ دۆستێكی (إنساني = humane) ئیتالیبووە پرۆژەی بەرهەمی (سەرچاوەی ئەو ڕاستییانەی كە لە جیهاندا شایانی باسن = مصدر الحقائق التي تستحق الذكر في العالم = the source of noteworthy facts of the universe) لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمدا داناوە ، بۆ ئەوەی كە زانستێكی تەواو لە هەموو مەوزعێكدا پێشكەش بەوكەسانە بكات كە خوێندەوارن بەڵام كتێبیان نیە بۆ خوێندنەوە ، هەروەها وانەی (درس) ڕۆشنبیرییانەی ئەوتۆیان بداتێ كە سوودی لێوەربگرن لە ژیانیاندا .

سامۆئیل تایلەر كۆلریج Samuel Taylor Coleridge[1] لە كتێبی (نامەیەكی سەرەتایی لە سەر بەرنامە) دا Preliminary treatise on method كە لە ساڵی ١٨١٧ دا دایناوە وتویەتی كەوا : گرنگترین مەبەست لە دانانی ئەو ئینسكلۆپیدیای میترۆپۆلیتانایەی Encyclopaedia-Metropolitana كە پێشنیاری كردووە دابنرێت ئەوەیە كە هونەرو زانیارییەكانی بەشێوەیەكی فەلسەفی چوون یەك تێدا پیشان بدرێن ، فەلسەفە بە یەكگرتوویی لە گەڵ ڕەفتاردا بە خەڵكی بگەیەنرێت و ڕەفتار بە ئاینی لە دڵدا چەسپیو بە هێز بكرێت) هەروەها دەڵێت كەوا دەیەوێت بە ڕێگەیەكی بەرنامەدار (زانستی پاك و بێگەردی كۆن بەرەو دوا ڕۆژ بگوێزرێتەوە بۆ پێشخستنی مرۆڤ) و كۆمەڵ بۆ بڵاو كردنەوەی زانستی بەسوود ، وەكوو لە ئینسكلۆپیدیای پێنیدا (Penny Cyclopaedia) دا لە ساڵی ١٨٣٤ ـ ١٨٤٣ دا دەرخراوە ، زۆربەی ئینسكلۆپیدیاكان هەوڵی ئەوە دەدەن كە چەند ڕژێمێكی زانستی پێك بهێنن ، جگە لەوەی دەیانەوێت هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی كە باسێكی گشتی دەربارەی هەموو لقە گەورەكانی زانستی پێشكەش بكەن ، هەروەها یارمەتی مرۆڤ بدەن لە پێكهێنانی بیرو ڕای وردو تەواوو لە دەست نیشانكردنی باشترین سەرچاوەی زانیاریدا لە كتێبی .

لە كتێبی (لقەكانی زانستی) دا (on the disciplines) كە لە ساڵی ١٥٣١ دا دانراوە ، مرۆڤ دۆستی ئیسپانی جوان لویس ڤایڤیس Juan luis vives ڕۆڵی ئینسكلۆپیدیای ڕوون كردوتەوە لە گەڕان بە شوێن ڕاستیدا . هەروەها لە ئەڵمانیادا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا واچاوەڕوان دەكرا كە ئینسكلۆپیدیا

زانستی‌یەکی ڕاستو پێویست پێشکەش بە کۆمەڵ بکات ، بەڵام بە نرخ‌ترین. هەوڵو تەقەللا ئەوەبوو کە لە لایەن ئەلیکساندەر ئەچیسۆنەوە = Alexander- Aitchison دراوەو واچاوەڕوان کراوە کەوا سوودی ئەو ئینسکلۆپیدیایەی کە بە ناوی ئینسکلۆپیدیای پێرثینسەوە Encyclopaedia Perthenis بووو لە ساڵی ١٧٩٦ ـ ١٨٠٦ دا دابنابوو جێگەی سوودی هەموو ئەو کتێبە ئینگلیزیانە بگرێتەوە کە لەو سەردەمەدا بە سەرچاوە (مصادر reference) دادەنران . هەموو ئەم بیرو ڕایانە دەنگدانەوەیەکی (صدیٰ) دووری ئەو بیرو ـ ڕا گریکی‌یانەن کە لە فەیلەسوف ئیفلاتۆنەوە Platon(٧) داکەوتوون ، ئیفلاتۆن دەڵێت : (بۆ ئەوەی باشتر بیر بکەیتەوە ، واباشە کە هەموو شتێك بزانیت) یان لە هەڵوێستی ڕۆمانی‌یەکانیشەوە (Roman) کە ئامۆژگاریی مرۆڤیان دەکرد بۆ ئەوەی هەموو جۆرە زانستێکی بەسوود بۆ خۆی وەربگرێت بۆ ئەوەی کە بتوانێت پێویستی سەرشانی خۆی لە ژیاندا بە تەواوەتی جێبەجێ بکات . چەمەکی ئێستا دەربارەی ئینسکلۆپیدیا وەکوو خاڵێکی سەرەکی دەست‌پێ‌کردن کە لێیەوە یەکێك بتوانێت دەست بە ئیش بکات لە گەشتێکی دۆزینەوەدا ، یان وەکوو خاڵێك سەرچاوەیەکی بنەڕەتی ئەوتۆ کە یەکێك هەمیشە باوەڕی پێ بکات . کەمێك لە دوو سەد ساڵ زیاترە کە شێوەی پەخشان (نثر = Prose) بە زۆری وەکوو هۆیەك یان ڕێگەیەك بۆ نواندنی بەندەکانی ئینسکلۆپیدیا جێگەی ڕەزامەندی بووە ، لە گەڵ ئەوەشدا وێنەی جیهان (صورة العالم = The image of world) ی ساڵی ١٢٤٦ کە هەندێك کەس دەیگەڕێننەوە بۆ گاوتیر دی میتز = Gautier de metz کە قەشەیەکی فەرەنسی شاعیربووەو هەندێك کەسی تریش بۆ پیاوە ئاینی (لاهوتی) یە فەلەمەمەنگی‌یەکان Flemish(٨) گۆسووین = Gossouin کە بە بەیتە شیعری هەشت بڕگەیی فەرەنسی نووسراوەو جین دی ماگنۆن = Jean de magnon جیهانی زانیاری‌یە (Science Verselle) ناتەواوەکەی لە ساڵی ١٦٦٣ دا داناوە کە لە دوو هەزار بەیت شیعری داستانی (ملحمي = Heroic) پێکهاتووە . تەنانەت وەکوو لە دواییدا لە ساڵی ١٧٨٣ دا شاعیری فەرەنسی ئەندرێ دی چینیر Andr'e de chenier بنیاتی نابوو کە ئینسکلۆپیدیاکەی دیدرۆ Diderot's Encyclopedia بە شیعر کورت بکاتەوە . هەروەها ئەوەش جێی ڕەزامەندی بووە کە ئینسکلۆپیدیا ڕێگەیەکی واقعی بگرێتە بەر هەتاوەکوو نووسەری لاتینی مارتیانەس ـ کاپیلا = Martianus capella کتێبێکی لە ساڵی (٤١٠ ـ ٤٢٩) زاییندا دانا لەم کتێبەدا مارتیانەس وای داناوە کە حەوت دەستە خوشکەکەی (إشبينة العروس bride maids) بووکەکە حەوت هونەرە بیروکەیی‌یەکان (الفنون النظرية = Liberal arts) دەنوێنن ئەگەر لێرەدا یاسای زمان (فقه اللغة Philology) بە بووکەکە دابنێین .. هەر لە سەر ئەم شێوازە (دۆمنیکۆ باندینی) لە سەر شەرەفی برینەکانی مەسیح (کوری مریەم) ئینسکلۆپیدیاکەی خۆی کردووە بە (٥) بەشەوە کەچی ئەلفونسۆ دی لاتۆر = Alfonso de latorre لە کتێبەکەیدا (خەیاڵێکی زۆر خۆش Delightful Vision کە لە ساڵی ١٤٣٥ دا داناوە شێوازێکی (ڕێگەیەکی) نیشانەیی (رمزي) گرتۆتە بەر بەوەی کە مندالێك دەرس لە ریزە کیژۆلەیەك وەردەگرێت ناویان : زانیاریی زمان (قواعد اللغة = Grammar) و زانیاریی لۆجیك (علم المنطق = Logic) و زانیاریی جوانکاریی‌و ڕەوانبێژیی (علم البيان و البلاغة = Rhetoric) .. هتد . مێژووی ئینسکلۆپیدیایەك ، کە بە پێی پیتی ئەبجەدی ڕێك خرابێت لە هەزار ساڵ کەمترنی‌یە . زوربەی ئەو ئینسکلۆپیدیایانەی کە پێش داهاتنی ئامرازی چاپکردن لە ئەورووپادا بڵاوکراونەتەوە ، بە شێوەیەکی ڕژێمی (کلاسیکی) ڕێك‌خراون ، دانەرە (نووسەرە) کۆنەکانی ئینسکلۆپیدیا ڕازین بە وتەکەی (سامۆئیل تایلەر کۆڵریج) کە لەوەپێش باسمان‌کرد . ئێستاکە چەندەها لەو ئینسکلۆپیدیایانە ماون کە بە شێوەی کلاسیکی کۆن ڕێکخراون ، هەتا ئێستا هیچ جۆرە ڕێکەوتنێك لە سەر چونێتی ڕێکخستنی پێرستەکانی (محتويات = فهرست = Index) ئینسکلۆپیدیا نەبووە . لەسەردەمی ڕۆمانی‌یەکاندا بەر لە دانانی ئینسکلۆپیدیادا ڕێبازی Approach کرداریی (عملي) یان گرتبووەبەر . لە پێشدا بابەتی وەکوو ئەستێرەوانی (علم الفلك = Astronomy) و جوغرافیا = Geography ، ئنجا هونەرەجوانەکان (الفنون الجميلة = Fine arts) . لە گەڵ ئەوەشدا نووسەرو لێپرسراوی دەوڵەتی ڕۆمانی

كاسیۆ دۆرەس = Cassiodorus[٩] لە كتێبی (خوێندنگەكانی = بەرنامەكانی فێركردنی = یاساو بیرو باوەڕەكانی = سەدەی ١٦ هەم) دا لە پێشدا بە ئینجیل (الكتاب المقدس = Scripture) و كڵێسە ، ئنجا تەنها بە كورتی باسی ئەو جۆرە بابەتانەی وەكوو ژمێرە (حساب = Arithmetic) و ئەندازەی (هندسة = Geometry) كردووە . سانت ئیزۆدۆری ئیشبیلی[١٠] = St. Isiodore of Seville كە بە بیرو باوەڕێكی كلاسیكی پەروەردەبووبوو لە سەدەی دوای ئەم سەدەیەدا هاو ـ سەنگییەكی هێنایە ئاراوە لەو بەرهەمەیدا كە بە ناوی (بیست كتێب لەسەر زانیاریی بنچینەو مێژووی وشە) وە واتا (اتیمولوجیا = Etymologiae = Etymology) بووە لە پێشدا گرنگی بە هونەرە بیرۆكەییەكان (الفنون الفكرية = Liberal arts) و پزیشكێتی (الطب = Medicine) داوە ، ئنجا لە دواییدا بە كتێبی پیرۆزی (الكتاب المقدس = bible) مەسیحییەكان بەڵام هێشتا ئەم بابەتانە هەر لە پێش بابەتی وەكوو كشتوكاڵو جەنگو كەشتییەوانی (الملاحة = Navigation) و كەلوپەلەوە دێن ، كۆنترین ئینسكلۆپیدیای عەرەبی كە تۆماركرابێت ئەوەبوو كە لە لایەن پیاوێكی ئاینیو مێژووناسەوە ئیبن قوتەیبەوە (إبن قتيبة[١١] = ibn Qutayba) دانراوە ، ناوی سەرچاوەی دەنگوباس (عيون الأخبار) بووە . لێرەدا ئیبن قوتەیبە لەسەر ڕێبازێكی تەواو جیاواز ڕۆشتووە ، بە بابەتی هێزو جەنگو پیاوچاكی دەستی پێكردووەو بە خواردەمەنیو ئافرەت كۆتایی پێ هێناوە . دوای ئەوە ئینسكلۆپیدیایەكیتر هاتووە كە لە ساڵی (٩٧٥ ـ ٩٩٧) دا لە لایەن زاناو لێپرسراوی دەوڵەت ئەلخوارزمی[١٢] = Al-khwarizmi یەوە دانراوە لەپێشدا بەبابەتی كۆمەڵەی یاساكان Jurisprudence و فەلسەفەی ئاینی (الفلسفة الدينية = Scholastic philosophy) دەستی پێكردووە . ئنجا گرنگترین بابەتی پزیشكيو ئەندازەو میكانیكی (الميكانيكا = Mechanics) خستۆتە كۆمەڵەی پلەی دووەمەوە بە ناوی (زانستی بیانی) یەوە . نموونەش بۆ ڕێبازی گشتی لە پۆلێن كردنی (تصنيف = Classification) ، لەسەدە ناوەڕاستەكاندا (العصور الوسطى = Middle ages) (ئاوێنە مەزنترەكەی) ڤینسێنتی بیوڤیاسی = Vincent of Beauvias بووە كە بە سێ برگە ڕێكخراوە : ـ سروشت (الطبيعة = Nature) : ـ خودا ، ئافەریدەكردن (خلق = Creation) مرۆڤ ، ئايينی یان بیرو باوەڕ (مذهبی = عقائدی = Doctrinale) : زمان (لغة) و خوو ڕەوشت (الأخلاق = Ethics) و پیشە (مهنة = Craft) و پزیشكێتیو مێژوو (تأريخ = Historiale) وەكوو مێژووی جیهان ، لە گەڵ ئەوەشدا دانەرەكانی ئینسكلۆپیدیا (الموسوعيون = Encyclopedist) هەر دوو دڵبوون لە چۆنێتی دوابەداو هێنانی (تتابع) مەوزوعەكاندا (بابەتەكاندا) .

هەرچەند ئەوانەی كە بە بابەتی ئايينی دەستیان پێكردووە ژمارەیان زۆرە ، بەڵام هەر ئەوانەشبوون كە یەكەم كەس بوون لە دانانی خاڵی كرداریدا = Practical topics . لێرەدا خاڵێكی گۆڕان (نقطة تحول) هاتۆتە ئاراوە ، ئەویش بە پرۆژە (نەخشە) ناتەواوەكەی فرنسیس باكۆن[١٣] Francis pacon بوو كە بە ناوی چاكردنی مەزنەوە (الاصلاح العظيم = Great instauration) بووەو لە ساڵی ١٩٢٠ دا ، لەم كتێبەدا باكۆن خۆی دوور خستۆتەوە لەو دەمەقاڵییە بێكۆتاییەی كە لەو سەردەمەدا هەبووەو پرۆگرامێكی سێ برگەیی (لیستەیی) داناوە وەكوو ئێستا باسی دەكەین : ـ

١ ـ سروشتی دەرەكی (الطبيعة الخارجية = External Natue) كە ئەمەش بابەتی وەكوو ئەستێرەوانیو كەشەوانی . (علم الأنواء الجوية = Meteorogy) و جوگرافیاو جۆرەكانی مەعدەنەكان (المعادن = Minerals) و سەوزەوات (خضروات = Vegetables) و گیاندارەكان (الحيوانات = Animals) دەگرێتەوە .

٢ ـ مرۆڤ (الانسان = Man) كە ئەم بابەتانە دەگرێتەوە : توێكاریی (التشريح = Anatomy) ، زانیاریی فرمان (علم الوظائف = الفسلجة = Physiology) ، پەیكەر (هيكل = Structure) ، هێز (القوة = Power) و كارەكان (الافعال = Actions) .

٣ ـ كاری مرۆڤ بەسەر سروشتدا : (Man's action on nature) ئەمەش ئەم بابەتانە دەگرێتەوە : پزیشكێتی ، كیمیا ، (الكيمياء = Chemistry) هونەرەبینایییەكان «الفنون البصرية = Visual arts) ، هەستەكان (الحواس = Senses) ، سۆز (العاطفة = Emotion) ، هێزە بیرییەكان واتا بەهرەكان

(القوى الفكرية أو الملكات العقلية = Faculties) ، هونەری بیناکردن (فنّ العمارة = Architecture) گواستنەوە (نقل = Transport) چاپکردن (طباعة = Printing) کشتوکاڵ (زراعة = agriculture) کەشتیەوانی و ژمێرەو گەلێك بابەتی تر . باکۆن لەم پرۆژەیەدا زیاتر لە ڕێکخستنێکی (ڕیزکردنێکی) زانیاریانەو پەسندیی بۆ ناوەڕۆکەکانی ئینسکلۆپیدیا هێناوەتە دی و ئەوەی زامن کردووە کە دانەری ئینسکلۆپیدیا پێویستە زانیاریەکی تەواوی پوختەی دەربارەی مەودای (مدی) زانستیی مرۆڤ هەبێت کە ئەمەش دەشێت وەکوو لیستەیەك بۆ پیاچوونەوە بەکار بهێنرێت (قائمة للمراجعة = check list) بۆ ئەوەی کە هەموو مەیانەکانی بیرو کۆششو هەوڵو تەقەللای مرۆڤ فەرامۆش نەکرێن . بەم جۆرەو بە بیروڕایەکی قووڵەوە (باکۆن) سەنەدی سەروتاری (مقال إفتتاحي = Leading article) ئینسکلۆپیدیا نووسەرەکانی گۆڕی ، تەنانەت دوای (١٣٠) ساڵ لەم مێژووە ، زانا (دیدرۆ) لە بڵاوکراوە سەرەتاییەکەی (نشرة أولية = prospectus) ئینسکلۆپیدیاکەیدا لە ساڵی ١٧٥٠ دا قەرزارباریی و سوپاسی خۆی بەرامبەر بە (باکۆن) پیشان داوە ، چونکە هەموو ئەو ئینسکلۆپیدیایانەی کە لە دوای ئەوەوە دەرچوون لە لایەن پرۆژەکەی (دیدرۆ) وە کاریان تێکراوەو تەنانەت هەتا ئێستاش ڕابەریی و ڕێنمایی (توجيه = Guidance) باکۆن هەردەوری خۆی دەبینێت .

(کۆلریج) کە لە لایەن پرۆژەکەی باکۆنەوە زۆرکاری تێکرابوو لە ساڵی ١٨١٧ دا خشتەی (جدول) ڕێکخستنێکی جیاوازی تری بۆ ئینسکلۆپیدیای مێترۆپۆلیتانا دانا کە لە پێنج بابەتی سەرەکی پێکهاتبوو : ـ زانیارییە پەتییەکان (العلوم الصرفة = PureSciences) شێوەیی یان سەرەکی Formal ، یاسای زمان (فقه اللغة = Philology) و زانیاریی ڕەوانبێژی (علم المنطق = Logic) و بیرکاریی (الرياضيات = Mathematics) و زانیارییە ڕاستەقینەکان (العلوم الحقيقية = Real sciences) : ـ میتافیزیك (میتافیزیقا = Metaphysics)[١١] و زانیاریی خوورەوشت (علم الأخلاق = Morals) و زانیاریی ئاینی مەسیحی (علم اللاهوت = Theology) ئینجا زانیارییە تێکەڵ (العلوم المختلطة = mixed) و کارپێکراوەکان = (العلوم التطبيقية = Applied sciences) ، زانیاریی تێکەڵ وەکوو زانیاریی میکانیك (Mechanics) ، هایدرۆستاتیك (زانیاریی هاوسەنگیو پەستانی گازاوەکان = موائع = هایدرۆستاتیکا = Hydrostatics) و زانیاریی ڕەوشتە میکانیکییەکان هەوا (علم الخصائص الميكانيكية للهواء = Pneumatics) و زانیاریی بینایی (علم البصريات = Optics) و زانیاریی ئەستێرەوانیو زانیارییە کارپێکراوەکان وەکوو زانیاریی تاقیکاریی = Exper-mental Philosophy) و هونەرەجوانەکانو هونەرە بەسوودەکانو مێژووی سروشتی (التاريخ الطبيعي = Natural history) و (بەکارهێنانی مێژووی سروشتی) کە بەرێگەی مێژووی ژیان (سيرة الحياة = Biographical) و مێژوویی (تأريخي = Historical) و زانیاریی کات واتا کرۆنۆلۆجی (علم الوقت = Chronology)[١٠] ڕیزکراون . فەرهەنگێکی ئەوتۆ کە هەمەڕەنگە (متنوع = Miscellaneous) بێتو بە پێی هونەری فەرهەنگ دانانو نەخشەی جوغرافی و فەلسەفەو زانیاریی بنەڕەتی وشە (Etmological) دانرابێت . بەشی پێنجەم بریتیبووە لە (لیستەی شیکردنەوەی سەرچاوەکان = analytical index) هەرچەندە کە شێوازی پۆلێن کردنەکەی (تصنيف = Classification) باکۆن لە لایەن بڵاوکەرەکەیەوە (ناشر = Publisher) دەستکاریی کرابوو هەرچەندە کە فەرهەنگەکەش زۆر سەرکەوتوونەبوو ، بەلام ئەو بیرو ڕایانەی کە تیایدا بوون هەمیشە هەرکارێکی باشی بەردەوامیان هەیە . دەتوانین بڵێین کە نزیکەی هەموو ئینسکلۆپیدیاکانی ئیمڕۆ بە پێی پیتی ئەلفو بێ ڕیزکراون ، بەلام جۆری پۆلینەکەی (باکۆن) و (کۆلریج) هەتا ئێستاش هەر یارمەتی دانەرەکان دەدەن لە نەخشەکێشانی ئینسکلۆپیدیادا ، ئەویش بەرەچاو کردنی ئەو جۆرە ڕیزکردنەی کە بۆ لقە هەمە جۆرەکانی زانستی دایان ناوە . شێوازی ڕیزکردنی ئەلفو بێیی (أبجدي) لە لایەن گریکی واتا یۆنانی = Greek و ڕۆمانییەکانەوە (رومان = Romans) زۆربەباش زانرابوو بەلام ڕۆمانییەکان کەمتر سوودیان لێ وەرگرتبوو .

ئینسکلۆپیدیاکەی (سانت ئیزۆدۆر) پۆلێن کراوبووەو فەرهەنگێکی لەسەر ڕۆشنایی زانیاری بنەڕەت و مێژووی وشەو

بە پێی ئەلف بێ ڕیزکراوی لە گەڵدابووە ، فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیایی (القاموس الموسوعي = Encyclopedic-Dictionary سەدەی دەهەم یان یانزەهەم کە بە سویداس (suidas) ناسراوبووە یەکەم نموونەی ئەم جۆرە ئیشەبوو کە بەتەواوی بە پێی پیتی ئەلف و بێ ڕێکخرابێت ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی گرنگی ئەوتۆی نەبووە بەسەر ئەو ئینسکلۆپیدیانەدا کە لە دوای خۆیەوە هاتوون ، هەرچەندە ئەگەر فەرهەنگۆکیشیان (مسرد بالكلمات العسيرة مع شرحها = Glossary) لە گەڵدا بووبێت و بە هەمان دەستوور ڕێکخراون . لە گەڵ ئەوەشدا کتێبەکەی باندینی (Bandini) کە بە ناوی (سەرچاوەی ئەو ڕاستییانەی کە شایانی باسن لە جیهاندا) هەر پۆلین کراوبووەو شێوازی ئەلف و بێ ی جیاجیا بۆ زیاتر لە چارەکێکی برگەکانی (بەندەکانی) بەکارهێنراوە . ئینسکلۆپیدیای نێرگزی (پۆلیانثەسی) تازە = The new polyanthus) کە لە لایەن دۆمنیکۆنانی میرابیلی ئیتالی = Domeniconani mirabelli) یەوە لە ساڵی ١٥٠٣ دا دانراوە لەسەر یەك شێوازی ڕیزکردنی ئەلف و بێ یی ڕێکخراوە . ئەمانە چەند نموونەیەکی دەگمەن بوون لە ئینسکلۆپیدیا ، لە گەڵ ئەوەشدا پێشکەوتنی کتوپڕی زانستی ڕاستەقینە شانبەشانی ئەو چەند فەرهەنگە ئینسکلۆپیدیاییانە هاتووە کە دەربارەی زمانی لاتینی دانرابوون و لە سەرەتای سەدەی ١٦ هەمدا دەرکەوتن . ناسراوترینیان زنجیرە بلاوکراوەیەك کە لە لایەن چاپکەری (طباع = Printer) فەرەنسی (چارلس ئیستینەوە = Charles estienne) چاپکرابوو ، دوا ئینسکلۆپیدیای گەورەی زمانی لاتینی لەسەر شێوازی ئەلف و بێ یی ڕێکخراوەو لە ساڵی ١٦٣٠ دا لە لایەن فەیلەسووف و زانای ئایینی (لاهوتی) پرۆتستانتی ئەڵمانی (جۆهان هەنریخ ئەلستید = Johann Hein-rich Alsted) ەوە دانراوە ، هەروەها کتێبی فەرهەنگی مێژوویی مەزن (القاموس التاريخي الكبير = The great historica-Dictionary) کە لە ساڵی ١٦٧٤ دا لە لایەن زاناو قەشەی کاثۆلیکی فەرەنسی ڕۆمانی (لویس مۆریری = Louis mor'eri) یەوە دانراوە کە هەردوو جۆرە ڕێکخستنەکەی : خۆماڵی (بلدي) Vernacular و ئەلف و بێ یی ، لە ئینسکلۆپیدیاکەدا پەسندکردووە ، ئەم جۆرە پەسندکردنە لە لایەن فەرهەنگی جیهانی = Universal dictionary سەرکەوتووەوە لە ساڵی ١٦٩٠ دا سەلمێنراوە . ئەم فەرهەنگەش لە لایەن فەرهەنگ دانەری فەرەنسی (ئەنتۆنی فورتییر) ەوە دانراوە ، دوای ئەوە ناو بەناو هەوڵ و کۆششی گرنگ دەدرا بۆ سەلماندنی بیروڕای پەسندکردنی ئینسکلۆپیدیای پۆلینکراو . ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٣٥ دا ئینسکلۆپیدیای پۆلین کراوی گەورە هاتە کایەوە وەکوو : ئینسکلۆپیدیای فەرەنسی = French Encyclopaedia لە لایەن (ئەناتۆل مۆتری) یەوە دانراوە . یەکەم ئینسکلۆپیدیای هۆڵەندی = Dutch-encyclopaedia پۆلینکراوی ڕژێمی تەواو لە ساڵی ١٩٤٦ ـ ١٩٥٢ داو ئینسکلۆپیدیای ئیسپانی = Spanish-Encyclopaedia لە ساڵی ١٩٥٥ ـ ١٩٦٠ داو ئینسکلۆپیدیای ئۆکسفۆردی بچووك = Oxford junior encyclopedia لە ساڵی ١٩٤٨ ـ ١٩٥٦ دا دانراوە . لە دێر زەمانەوە بڕیار وابوو کە سێ سووچکەیی (ثلاثية = Trivium) واتا (ڕێزمان و ڕەوانبێژی و بەلاغە) و چوارسووچکەیی (رباعية Quadrivium) واتا (ئەندازەو ژمێرەو ئەستێرەوانی و مۆسیقا) دەبێت بەشی سەرەکی بن لە هەموو ئینسکلۆپیدیایەکدا . کاتێك کە (لویس شۆرس) Louis shores بوو بە سەرەکی لیژنەی دانانی (ئینسکلۆپیدیای کۆلایر = Collier's encyclop aedia) لە ساڵی ١٩٦٢ دا وتی : (من وای دادەنێم کە ئینسکلۆپیدیا یەکێکە لەو ڕێسا ـ قاعدة ـ گشتییە کەمانەی کە کاردەکەنە سەر پسپۆڕیتی و لەوەدا سوودیان هەیە کە زانستیی ڕێك و پێکمان دەهێننەوەبیر) .

ئەم وتەیەش دەنگدانەوەیەك بوو بۆ بیرو ڕاکەی چیرۆك نووسی ئینگلیز (ئێچ ـ جي ـ وێلز = H. G. Wells) کە دەڵێت : (نابێت ئینسکلۆپیدیا تەنها کۆمەڵە وتارێکی هەمەڕەنگەبێت ، بەڵکو کوتڕ کردنەوەو ڕوون کردنەوەو دانانێكبێت) . زانای کۆمەڵ ناسی (عالم إجتماعي = Sociologist) نەمسایی (ئۆتۆنیورات) لە هەمان ساڵدا پێشنیاری کردووە کەوا (ئەو ئینسکلۆپیدیا جیهانییە تازەیەی کە زانیارییەکانی تێدا یەکخراون لەو سەلکەپیازە دەچێت کە گەلاکانی دەوری یەکتریان داوەو لە بنکەکەدا یەکیان گرتووە) ئەو سووربوونە (إصرار) تازەیەی کە

ئیمرۆ لە سەر یەکێتی زانستی (زانیاریی) و پەیوەندی ئالۆگۆڕی نێوان لقەکانی زانیاری هەیە ، ئەوە دەردەخات کە ئیمرۆ ئینسکلۆپیدیا دانەرەکان زۆر ئاگادارن لە ڕۆڵە پەروەردەیی یەکەیاندا و لەوەدا کە دەشێت شێوازی ڕێکخستنی ئەلف و بێ یی چوارچێوەی (پەیکەری) پۆلێنکردن بشارێتەوە ، هەرچەندە کە ئەو چوارچێوەیە بەشێکی تەواوکەرە لە باشترین ئینسکلۆپیدیادا .


سەرچاوەکان : ـ

1 — The new Encyclopaedia Britannica, Volume-6 15 th Edition, Pages. 779-799.

2 — The Hamlyn All-Colour Dictionary. H.E Priest Ley Page 96.

٣ ـ الموسوعة العربية الميسرة /محمد شفيق الغربال/مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر ـ القاهرة ١٩٦٥.

٤ ـ المنجد : معجم عربي ـ عربي في اللغة والادب والعلوم / الطبعة التاسعة عشرة / الفه الاب لويس معلوف اليسوعي المطبعة الكاثوليكية ـ بيروت ١٩٦٦/ص ١٨٩ ، ١٩٠ قسم الاعلام .

٥ ـ المورد : قاموس إنكليزي ـ عربي AL-MAWRID تاليف منير البعلبكي ـ الطبعة الحادية عشرة / دار العلم للملايين بيروت ١٩٧٧ .

٦ ـ القاموس العصري / عربي ـ إنكليزي تاليف إلياس انطوان اليلس ، الطبعة التاسعة ، المطبعة العصرية ـ القاهرة ١٩٦٢ .


**پەراوێزەکان :**

١ ـ ئینسکلۆپیدیا : ئەم زاراوەیە لە بنچینەدا فەرەنسی یە مانای (بازنەی زانستی یەکان) دەگرێتەوە . ئێخا وەکوو خۆی بمێنێتەوە واتا (ئینسکلۆپیدیا) یان بکرێت بە (بازنەی زانستی یەکان) واتا (دائرة معارف) وەکوو لە عەرەبیدا ، یان لە جیاتی ئەمانە (فەرهەنگی فراوان) یان (کەڵە فەرهەنگ) بەکار بهێنرێت .. من ئەمە ئەخەمە بەردەستی کۆڕی زانیاری کوردو خوێنەرانی بەڕێز بۆ ئەوەی کە یەکێکیانی لێ پەسند بکەن و لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا و تووێژی لە سەربکەن .

٢ ـ فرانسوا رابلیە F. rabelais ١٤٩٤ ـ ١٥٥٣ یەکێک بووە لە نووسەرە فەرەنسی یە بە ناوبانگەکان . زانیاریی ئایینی (لاهوتی) خوێندووەو بووە بە راهیب ، هەروەها زانیاریی پزیشکیشی (طبّ) خوێندووەو سەردەمێک پزیشک بووە ، زۆری حەز لە گەشت و گوزار کردووە چی لە فەرەنسا چی لە ئیتالیادا .
سەرچاوە : ١ ـ فەرهەنگی (المنجد ـ الاعلام) لاپەڕە ٢٠٩ .
٢ ـ گۆڤاری (العربي) کوێتی لاپەڕە ١١٤ .

٣ ـ فەرهەنگ (قاموس) [ Dictionary = The saurus ] : کتێبێکە لیستەی وشەو ماناکانی تێدایە بە هەمان زمان یان بە زمانێکی تر یان زیاتر ، وەکوو : فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی زانیاریی .
تێبینی : جیاوازیی نێوان ئینسکلۆپیدیاو فەرهەنگ (قاموس) لەوەدایە کە ئینسکلۆپیدیا هەر ئەوەنی یە کە پێناسەیەک دەربارەی ئەو مەوزوعە پێشکەش بکات ، بەڵکو مێژووی مەوزوعەکەش (باکورتە باسێکیش بێت) و پەیوەندی یەکانی بە بابەتەکانی تریشەوە ڕوون دەکاتەوە .

سەرچاوەکان : ١ ـ فەرهەنگی (المنجد ـ الاعلام) لاپەڕە ٤٠٣ ـ ٤٠٤ ٢ ـ الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ١٧٨٠ .

٤ ـ دینیس دیدرۆ Diderot ١٧١٣ ـ ١٧٨٤ : بلیمەت و ئینسکلۆپیدیا دانەرو فەیلەسووف و ڕەخنەگری ئەدەبی و هونەریی و چیرۆکنووس و نووسەریی شانۆیی فەرەنسی یە ، لە ساڵی ١٧٤٧ دا بوو بە سەرۆکی دەستەی دانەرانی ئەو ئینسکلۆپیدیایەی کە ناسراوترین نووسەری ئەو سەردەمە بەشدارییان تێدا کردبوو ، ناوەکەی نووساوە بە بزووتنەوەی ئینسکلۆپیدیا دانانەوە .
سەرچاوەکان : الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ٨٣٠ .

٥ ـ ساڵنامە (تقويم سنوي) Calendar ، ساڵنامەی وڵاتان (تقويم البلدان = Geographical-dictionary ، وەکوو ئەو ساڵنامەی وڵاتانەی کە لە لایەن (ابى الفداء) ەوە دانراوەو کردوویەتی بە پێشەکییەک و (٢٨) خشتەوە (جداول) کە مەوزوعە بنەڕەتی یەکانی جوغرافیاو باسی (٦٢٣) وڵاتی ئیسلامی تێدایە .
سەرچاوە : المنجد/ الأعلام / لاپەڕە ١١١

٦ ـ کولریج ، ساموئیل تیلەر ١٧٧٢ ـ ١٨٣٤ : شاعیرو ڕەخنەگرو فەیلەسووفی ئینگلتەرە ، یەکێکە لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی ڕۆمانسی لە شیعرو بیرو ڕادا لە ئینگلتەرە . سەرچاوە : الموسوعة العربية الميسرة /لاپەڕە ١٥٠٩.

٧ ـ ئیفلاتۆن : (٤٣٠ ـ ٣٤٧ بە رلەزایین) یەکێکە لە فەیلەسووفە یۆنانی یە بە ناوبانگەکان ، قوتابی سوقرات و مامۆستای ئەرستۆ تالیس بووە ، کەلێک کتێبی داناوە وەکوو (کۆمار = الجمهورية) یان (رامیاریی = السياسة) و کریتۆن و Criton و فیدۆن و Ph'edon و تیمە Timee سەرچاوە : الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ١٨١

٢ ـ المنجد / الأعلام / لاپەڕە ٢٨

٨ ـ زمانی فەلەمەنگی (اللغة الفلمنكية) Fleming : شێوەیەکە لە زمانی ئەڵمانی باکوریی‌و نزیکە لە زمانی هۆڵەندی‌یەوە ، میللەتی فلاندەر Flandre کە دەکەوێتە نێوان بەلجیکاو فەرەنسەوە قسەی پێدەکە ن.

سەرچاوە : ١ ـ المورد / لاپەڕە ٣٥٤

٣ ـ المنجد / الأعلام / لاپەڕە ٣٩١

٩ ـ کاسیۆدۆرس : نزیکەی (٤٨٠ ـ ٥٧٥) : ڕامیارو دانەرێکی ڕۆمانی‌بووە ، پایەیەکی بەرزی لە سەردەمی تیۆدۆریکی گەورەدا هەبووە ، کۆمەڵێکی لە بڕوانامە هەمە جۆرەکانی (وثائق) دەوڵەت پۆلێن‌و ڕێك خستووەو هەندێك کتێبیشی داناوە .

سەرچاوە : الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ١٤٢٧ .

١٠ ـ ئیزیدۆری ئیشبیلی (٥٦٠ ـ ٦٣٦) : زانایەك قەشەیەکی ئیسپانی‌بووە، بە دانانی ئەو ئینسکلۆپیدیایە بە ناوبانگ بووە کە ناوی (الأصول) بووە کە تیایدا زانیاری‌یەکانی ئەو سەدەیەی خۆی تۆمارکردووە ، کە بە یەکێك لە ئینسکلۆپیدیایە کەمەکانی لاتینی دادەنرێت هەرچەندە کە هەندێك هەڵەی زمانەوانی‌و زانیاریشی تێدابووە ، چونکە شارەزاییەکی تەواوی لە زانستی یۆنانیدا نەبووە . هەروەها کتێبێکی بە ناوی گەورە پیاوانەوە (مشاهير الرجال) داناوە کە بەسەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت لە وتنەوەی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا .

سەرچاوە : الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ٢٨٥

١١ ـ إبن قتيبة عبدالله بن مسلم الدينوری (٨٢٨ ـ ٨٨٩) : نووسەرێکە لە کوفە یان لە بەغدا لە دایك بووەو تیاشیا مردووە . ماوەیەك لە (دینۆر) قازی بووە ، ئنجا لە بەغدا مامۆستابووە ، شارەزایی لە زانستی‌یەکانی سەدەی خۆیدا هەبووەو کتێبی پۆلێنکراوی (مصنفات) باشی دەربارەیان داناوە : بە ناوبانگ‌ترینی کتێبە مێژووییەکانی (عيون الأخبار) ، (المعارف) .. بوون . (عيون الأخبار) واتا سەرچاوەکانی دەنگوباسەکان ، لە کاتی خۆیدا وەکوو ئینسکلۆپیدیایەك وابووە ، لە میسر چاپکراوە .

سەرچاو : ١ ـ الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ٢٢٥ ٢ ـ المنجد / الأعلام / لاپەڕە ٣٦٤

١٢ ـ ئەلخوارزمی محمد بن احمد (سەدەی دەیەم) : لە (بلخ) لە دایك بووەو لە (نیسابوور) لە کۆشکی سامانی‌یەکاندا ژیاوە ، کۆنترین ئینسکلۆپیدیای عەرەبی بە ناوی کلیلەکانی زانیاریی‌یەکان (مفاتيح العلوم) بۆ وەزیری سامانی‌یەکان ئەلعەتبی (العتبی) داناوە ، ئینسکلۆپیدیایەکەی کردووە بە دوو بەشەوە : یەکەمیان بۆ زانیاریی‌یە عەرەبی‌یەکان (العلوم العربية) : وەکوو شەریعەت‌و یاسلو ئاخاوتن‌و مێژوو ، ئەوی تریان بۆ زانیاریی‌یە بیانی‌یەکان (العلوم الدخيلة) وەکوو فەلسەفەو ڕەوانبێژی‌و پزیشکێتی‌و ژمێرەو ئەندازەو بە کورتی گرنگترین زاراوەکانیانی دەست نیشانکردووە . لە لایەکی ترەوە دەڵێن گوایە ئەم کتێبەی بە وەزیرێك لە وەزیرەکانی نوح (٢)، ی سامانی ، لە ساڵی (٩٩٧) دا پێشکەش کردووە . ئەم ئینسکلۆپیدیایە بەهایەکی بەنرخی لە لایەن خۆرهەڵات ناسەکانەوە هەیە ، لە لایەن (فان فلوتن) ەوە لە ساڵی ١٨٩٥ دا لە (لیدن) (شارێکە لە هۆڵەندە) چاپکراوە :

سەرچاوە : ١ ـ الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ٧٦٧ ـ ٧٦٨ ٢ ـ المنجد / الأعلام / لاپەڕە ١٨٢ ، ٥٠٦ .

١٣ ـ فرانسیس باکۆن (١٥٦١ ـ ١٦٢٦) : فەیلەسووف‌و ئەدیبێکی ئینگلیزبووە ، لە لەندەن لە دایکبووە ، گەلێك مەقانی بەرزی لە دەوڵەتدا داگیرکردووەو بەرهەمی نایابی لە مەیانی ئەدەبدا هەیە ، هەروەها لە مەیانی فەلسەفەدا (بەرنامەی تاقیکاریی نوێ) . باوەڕی بە تێبینی‌و تاقی کردنەوەو بۆ دەرکەوتن (إستنتاج) هەبووە . بە ناوبانگترینی کتێبەکانی (ئەتلەنتسی تازە) ، (گەشەپێدنی زانیاریی‌یەکان) و (ئۆرگانۆنی نوێ = Nojum Organum) ، فرانسیس باکۆن بە پێشەوای هەموو فەلسەفەی ئینگلیزی دادەنرێت سەرچاوە : ١ ـ الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ٤٦٩ ٢ ـ المنجد / الأعلام / لاپەڕە ٦١

١٤ ـ میتافیزیك (میتافیزیقا Metaphysics) لقێکە لە فەلسەفە لە ڕاستی سەرەتایی بوون (وجود) دەکۆڵێتەوە ، فەیلەسووف ئەرستۆ ناوی (فەلسەی سەرەتایی) لێ ناوە ، هەروەها پێشی دەوترێت دوای سروشت (مابعد الطبيعة) چونکە ئەو کەسانەی کە نوسراوەکانی (دانراوەکانی) ئەرستۆیان پۆلێنکرد ، ئەو نامانەی کە ئەرستۆ دەربارەی فەلسەفەی سەرەتایی نووسیبوونی لە دوای (زانیاریی سروشتە = علم الطّبيعة) وە دایان ناون .

سەرچاوە : الموسوعة العربية الميسرة / لاپەڕە ١٧٩٤ ـ ١٧٩٥

١٥ ـ کرۆنۆلۆجی chronology : دابەشکردنی وەخت ← بۆ چەندماوەیەك (فترة) ، دەستنیشانکردنی مێژوویەکی ورد بۆ ڕووداوەکان‌و ڕێکخستنیان بە پێی ڕیزی وەخت ، خشتەی کرۆنۆلۆجیش خشتەیەکە مێژووە وردەکانی ڕووداوەکان بە ڕیزکراوی بە پێی وەخت پیشان‌دەدات .

سەرچاوە : المورد / لاپەڕە ١٧٧

# سورێژە

Measles

ئامادە کردنی : برایم محێدین عارف

نەخۆشیەکی ڤایرۆسی درمیە ، بە هۆی ڤایرۆسی (Measles)وە بلاودەبێتەوە ، بە شێوەیەکی گشتی لە مندالدا بلاوەو لە دوای تەمەنی شەش مانگیەوە تووشدەبن . زۆر بە دەگمەن مندال لەم نەخۆشیە دەرباز دەبێت ، کاتێك تەمەنی لە شەش مانگ پترو بەرەو ژوورە . بەلام زۆرکەم پێش شەش مانگی روو دەدات و ناوێزە .

هۆی تووش نەبوونی کۆرپە بەم نەخۆشیە ، کاتێك کە تەمەنی لە شەش مانگ کەمترە ، دەگەرێتەوە بۆ ئەو بەرگرییەی کە لە دایکەوە گوێزراوەتەوە بۆ کۆرپە ، بە هۆی خوێنەوە ، چونکە ئەوەی یەك جار تووش نەخۆشیەکە بووبێت (وەك دایك) بە رگرییەکی چاکی لێ چنگ کەوتووە .

سورێژە وەك نەخۆشیەکی قورس و ترسناك ناسراوە ، لە کۆندا بە هۆی کوشندەیی نەخۆشیەکەو رادەی ترسانی خەلکی لە نەخۆشیەکە ، بە « مبارەکەکە »[1] ناوبراوە .

وە بە تەنینەوەی نەخۆشیەکە ، مردن و ناشتن هاتۆتە ئاراوە ، هەر بۆیەش ووتراوە « سورێژە ، بینێژە »[2] .

**چۆنێتی بلاوبوونەوەو تەنینەوەی نە خۆشیەکە :**

ڤایرۆسەکە بەم رێگایانەی خوارەوە بلاو دەبێتەوەو بۆ لەشی مرۆڤێکی ساغ دەگوێزرێتەوە .

١ ـ بە هۆی دەردراوەکانی بۆریەکانی هەناسە لە کاتی پژمین و کۆکینی نەخۆش بە سەر یەکێکی تردا .

٢ ـ بە هۆی لێکەوتنی راستەوخۆ وەك ماچکردن .

٣ ـ بەکارهێنانی دەستە سری پیس (هەلگری ڤایرۆسەکە) .

٤ ـ مانەوە لە ژووری تایبەتی سورێژە لە نەخۆشخانەکاندا .

**نیشانەکانی :**

سورێژە بەم سێ قۆناغەدا تێپەر دەکات .

**قۆناغی یەکەم :**

بە چوونە ژوورەوەی ڤایرۆسەکە بۆ لەشی مرۆڤ تا دەرکەوتنی نیشانەکانی دەووترێت (سوری کرکەوتن) . ئەم سورەش (١٠ ـ ١٢) رۆژ دەخایەنێت ، لە زۆر کەسدا (٦) رۆژ دەخایەنێت .

لەم قۆناغەدا هیچ نیشانەیەکی دیاری نەخۆشیەکە رەچاو ناکرێت ، کە پزیشك بتوانێت نەخۆشیەکەی تەواو بی دەستنیشان بکات ، جگە لە چەن نیشانەیەکی سەرەتایی ، کە یاریدەی تەواوی دەست نیشانکردن نادەن .

وەك :

* تا : پلەی گەرمای لەشی نەخۆشەکە بەرزدەبێتەوەو تا دای دەگرێت .

* چاو سوربوون و ئاوکردنی چاو : چاوی مندالەکە سور دەبێت و ئاودەکات ، مندالەکە حەز بە تیشکی هەتاو رووناکی ناکات ، گەر مندالەکە بەر رۆشنایی بکەوێت چاوی دادەخات .

* دەنگ گۆران و کۆکە : دایك یان هەر کەسێکی تر هەست دەکات دەنگی مندالەکە گۆراوەو گربووە ، جار جارەش ووشکە کۆکەیەك دەیگرێت .

باری تەندروستی گشتی نەخۆشەکە لەم قۆناغەدا ئاسایی نەیەو چاوەروانی نەخۆشیەکی قووری لێ دەکرێت .

**قۆناغی دووەم :**

نیشانەکانی دوای سوری کرکەوتن بە تەواوی دەردەکەون ،وەك : کۆکە ، هەلامەت ، پژمین ، خەوزران و کەم خەوی ، کەم بوونەوەی ئارەزووی خواردن ، تایەکی قوورس کە رەنگە هەندێك جار ببێتە هۆی لووت پژان . ئەم

نیشانانە لە زۆر منداڵدا بە توندو تیژی دەردەکەون ، دەبنە هۆی ئارام نەگرتن و نارەحەت بوونی منداڵەکە بە تایبەتی پێش دەرکەوتنی (سوورە پەڵەی پێست) « Skin Rash » .

ئەم قۆناغە چەن رۆژێك دەخایەنێت ، لە رۆژی سێیەمیندا نیشانەیەکی هەرە گرنگی سورێژە دەردەکەوێت ، کە یارمەتیەکی تەواوی دەست نیشان کرد دەدات و لە زۆر نەخۆشیەکەی جیا دەکاتەوە ، ئەم نیشانەیەش دەرکەوتنی پنتکی (کۆپلیك)ە « Koplik » .

ئەم پنتکانە سپی و دەوریان سوورە ، لە سەر رووپۆشی ناوەوەی دەم و گوپ دەردەکەون .

ئەم پنتکانە لە ماوەی چەن رۆژێکدا نامێنن و سوورە پەڵەی پێست دەردەکەون ، لەم کاتانەدا ڤایرۆسەکە لە خوێنی نەخۆشەکەدایەو بۆ ماوەی (٢٤ ـ ٢٨) کاژێر تا دوای دەرکەوتنی پەڵەکان لە سووڕی خوێنی نەخۆشەکەدا دەمێنێتەوە . سورەپەڵەی پێست یەکەمین جار لە سەر پێستی پشت یان تەنیشت گوێوە دەردەکەون ، پاشان لە سەر دەم و چاوو دەست و سنگ ، لە ماوەی چەن کاژێرێکدا تێکرای بەشەکانی تری لەشی نەخۆشەکە دەگرێتەوە کەبە پەنجەکانی پێ کۆتایی دێت .

دوای (٢ـ٣) رۆژ پەڵەکان بەرەو نەمان و لە ناو چوون دەچن ، لە سەرەتاوە پەڵەکانی بەشەکانی سەرەوەی لەش (دەمووچاو) نامێنن ، پاشان بەرەبەرە بەرەو بەشەکانی خوارەوەی لەش (پێیەکان) دەچن ، پێست توێکڵێك لە شوێنی پەڵەکان هەڵدەدات ، لە هەندێ منداڵی لاوازدا پەڵەکان شوێنە وارێك بە جێ دەهێڵن کە (٦ ـ ٧) رۆژێك دەمێنێتەوە .

بە نەمانی پەڵەکان (تا)ش نامێنێت ، ئەوەی شایانی باس کردن بێت ، پلەی گەرمای لەش لە گەڵ پەڵەکاندا راستەوانە دەگونجێت ، واتا بەدەست پێکردنی نەمانی پەڵەکان پلەی گەرمای لەشیشی نزم دەبێتەوە ، دوای لە ناو چوونی پەڵەکان تاکەیشی نامێنێت .

**قۆناغی سێیەم :**

لەم قۆناغەدا نەخۆشەکە یان بەرەو چاك بوونەوە دەچێت ، یان تووشی چەن ماکێك دەبێت کە لە ئەنجامی تووش بوون بە نەخۆشیەکە پەیدادەبن و پێیان دەووترێت (ماکی سورێژە) . گرنگترین ماکەکانیشی ئەمانەن :

١ ـ هەوکردنی گوێی ناوەوە .

٢ ـ سوتانەوەی پەرەی مێشك .

٣ ـ هەوکردنی سی یە کان .

٤ ـ هەوکردنی مێشك (کەمتر روودەدات) .

٥ ـ چاو ئێشە .

**دەست نیشانکردن :**

پێویستە سورێژە لە چەن نەخۆشیەك جیا بکرێتەوە وەك

* سورێژەی ئەڵمانی (Rubella) .

**١ ـ لە سورێژەی ئەڵمانیدا پنتکەکانی کوپلیك نین .**

**٢ ـ سورێژەی ئەڵمانی دەبێتە هۆی هەڵ ئاوسانی لیمفە گلاندەکانی پشت مل .**

**٣ ـ سورە پەڵەی پێست لە سورێژەی ئەڵمانیدا تەنك دەردەکەون و دوای دوو رۆژ نامێنن .**

* سوورەتا (Scarlet — Fever)

**١ ـ لە سورەتاشدا پنتکەکانی کوپلیك نین .**

**٢ ـ سوورە تا دەبێتە هۆی (ئاڵووکەوتن) بە هۆی هەندێ میکرۆباتەوە .**

* حساسية الجلد من تناول بعض الادوية (طفح دوائي) .

بریتی یە لە خوران و سور هەڵگە رانی پێست و دەرکەوتنی چەن پەڵەیەك کە لە ئەنجامی خواردنی هەندێ داوو دەرمانەوە پەیدا دەبن .

**١ ـ لێرەشدا پنتکەکانی کوپلیك نین .**

**٢ ـ چەن نیشانەیەك کە لە سورێژەدا هەن لێرەدا دەرناکەون وەك : کۆکە . تایەکی قوورس ... .**

**٣ ـ پەڵەکانی پێست لێرەدا لە دوای خواردنی چەن دەرمانێکی دیارەوە دەردەکەون وەك بنسلین . سلفا ...**

**چارەسەرکردن :**

بۆ چارە سەرکردنی نەخۆشیەکە پێویستە پەیرەوی ئەم خاڵانە بکەین .

١ ـ چاودێری کردنی منداڵەکەو ، حەسانەوەی لە ژوورێکی پاك و خاوێندا ئەگەر مەترسی نەخۆشیەکەی لێ بکرێت ، وە

تادەتوانرێت نەهێڵرێت تیشکی هـەتاو ڕووناکی لە ژوورەکە بدات ، چونکە منداڵەکە لە ڕۆشنایی دەترسێت .

٢ ـ گرنگی بایەخ دان بە خواردنی منداڵەکە ، بە جۆرێك ئەو خواردنانەی بدرێتێ کە زوو وە ئاسان هەرس دەبن لە گەدەدا وەك شیر ، چایی ، میـوە ، بسکیت ، ڤیتامینـات بە تـایبەتی ڤیتامین C .

٣ ـ بە کارهێنانی دەرمان بە شێوەی دڵۆپ و مەڵهەم لە کاتی چاو سووربوون و چاو ئێشـەدا ، مەلهـەمەکـە پێش نووستن بکرێتە چاو .

٤ ـ نەخۆشەکە لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت ، (بە تایبـەتی بە دەست پێ کردنی قۆناغی دووەم) لە ژێر چاودێری پـزیشکی تایبەتیـدا وە دەرمانی (بنسلین) بـدرێتە منـداڵەکە تـا تووش ماکەکانی نەخۆشیەکە نەبێت .

**خۆپاراستن :**

باشترین ڕێگا بۆ خۆپاراستن وە دووربوون ، وە تووش نەبوون ، بەم نەخـۆشیە ، تێکـەڵ نەبـوونی منداڵە لە گـەڵ ئەوانەی تووشی نەخۆشیەکە بوون . وە نەهێشتنی چوونیان بۆ ماڵان و نەخۆشخانەکان و ئەو شوێنە گشتی یانەی کە ڤایرۆسی نەخۆشیەکەی لێ بڵاودەبێتەوە .

وە دەتوانین منداڵەکە دژ بە نەخۆشیەکـە بکوتـین پێش ئەوەی تووش نـەخۆشیـەکە بـووبێت . ئەویش بـە ڤاکسینی (M.M.R) کە دژ بە سورێژەو سورێژەی ئەڵمانی و ملەخرێیە ، کە نیو سی سی بە ڕێگەی ژێر پێست لە سەر شان دەدرێت .

بەم کوتاندنە ڤایرۆسەکە دەچێتە لەشی منداڵەکەوە بـە جۆرێك کە نیوە زیندووە .

ئەم کوتاندنە بۆ ئەو منداڵانەیە کە تەمەنیان لە سـاڵێك پترەو لە (15) ساڵ کەمترە .

هەندێ منداڵ چەن نیشانەیەکیان دوای ئەم کوتاندنە لێ ڕوودەدات . دەتوانین منـداڵەکە بـە دژەتەنی (گـاماگلوبـین) بکوتین دوای کوتاندنی ڤاکسینی سورێژە بە ڕێگەی ماسولکـە (سمت) ئەم مادەیە دەبێتە هۆی سووك کردنی نەخۆشیەکە ، ئەگەر پێش دەرکەوتنی پەڵەکـان بکوتـرێت ، وە بەرگـری بۆ ماوەیەك ، ئەگەر (٥) ڕۆژ دوای تـووش‌بوونی نـەخۆشیـەکە بکوترێت .

ئەو بەرگریەی کـە منداڵ بـە هۆی کـوتانـدنەوە وەری دەگرێت ، کەمترە لەو بەرگریەی کـە بە هـۆی تووش بـوونی نەخۆشیەکەوە وەری دەگرێ .

**پەراوێز :**

(١)،(٢) لە کۆمەڵی کوردەواری خۆماندا ووتراوە کاتێـك داوو دەرمانی پزیشکی کەم‌بووە .

**سەرچاوەکان :**


١ ـ امراض الاطفال/الدکتور مظفر عبدالوهـاب السامـرائي/الجزء الاول ـ الطبعة الثالثة ـ ١٩٨١ .

٢ ـ گوڤاری (علوم) ژمارە (٨)ی حوزەیرانی ١٩٧٨ .
ساڵی دووەم/ د. محمود الحاج القاسم ل١٨ ـ ١٩/بغداد .

٣ ـ ڕۆژنامەی (الجمهورية ـ ملحق طب وعلوم) ژمارە ٥٧١٨ ساڵی هەژدەهەم .


**فەرهەنگۆك**

درم : معدی .
ناوێز : شاذ .
سوڕی کرکەوتن : دور الحضانة (فەرهەنگی زانیاری مامۆستا کمال جلال غريب بەرگی دووەم ٣٨٦ ).
سوورە پەڵەی پێست : الطفح الجلدي .
پنتك : بقع .
سوتانەوەی پەرەی مێشك : التهاب السحايا .
هەوکردنی سییەکان : إلتهاب الرائتين .
سورێژەی ئەڵمانی : الحصبة الالمانية .
سورتا : حمى القرمزية (فەرهەنگی زانیاری ٢٢٤) .
ئاڵوکەوتن : التهاب اللوزتين
دڵۆپ : قطرة .
ڤاکسین : اللقاح .
ملەخرێ : النكاف .
ماك : المضاعفات .
بەرگری : المناعة .

# قەڵاچۆکردنی زیندەگی

## « المكافحة الحيوية »

## control Biological

● جلال حمدامین ●

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە ئادەمیزاد زیانێکی زۆری لە جرو جانەوەرەوە « الحشرات » (insect) [1] پێدەگات ، جا ئەو زیانانە یاڕاستەوخۆن ئەویش بە تووش‌بوونی بە گەلێك نەخۆشی جۆراوجۆر کە جرو جانەوەر دەبێتە هۆی گواستنەوەی « میکرۆبی » نەخۆشیەکە ، وەکو نەخۆشی « ملاریا » کە بە هۆی مێشوولەی (انوفلس) وە دەگوێزرێتەوە بۆ ئادەمیزاد ، یاخود نەخۆشی (تیفوس) کە ئەسپێ دەبێتە هۆی گواستنەوەی میکرۆبی نەخۆشیەکە وە هەروەها نەخۆشی [ نووستن ] [ مرض النوم ] کە لە ئەفریقیا نەخۆشیەکی باوە ئادەمیزاد دووچاری دەبێت بە هۆی مێشی [ تسی تسی ] کە هەڵگری میکرۆبی نەخۆشیەکەیە .وە گەلێك نەخۆشی تر .. هتد .

یاناڕاستەوخۆن بەوەی زیان دەگەیەنێت بە بەرووبوومی کشت‌وکاڵی [ جا چ بەرووبوومی ئاژەڵی‌بێت یان ڕووەکی ] .

لەبەر ئەو هۆیە ئادەمیزاد لە کۆنەوە لە گەڵ جرو جانەوەر لە کێشەیەکی توند دایەو هەوڵی قەڵاچۆکردنی داوە .

دوای پێشکەوتنی زانیاری ، ئادەمیزاد چەند ڕێگەیەکی بۆ قەڵاچۆکردنی جرو جانەوەر بەکارهێناوە ئێمە باسی هەندێك لەم ڕێگایانە چ لە باری چاکی یاخود خراپی بێت دەیخەینە ڕوو .

یەکەم : قەڵاچۆکردنی میکانیکی [ Mechanical control ] ئەوە بە سادەترین ڕێگە دەژمێردرێت ، وەکو کێڵانی ئەو زەویانەی کە هەندێك جرو جانەوەر گەرای تیا دادەنێت دوایی کۆکردنەوەی گەراو سووتاندنی [ وەکو لە قەڵاچۆکردنی کوللەی بیابانی بەکار هاتووە ][2] ، یاخود ڕشاندنی ئەو گۆم و زەنەکاوانەی کە (لارڤای) « Larvae » هەندێك جرو جانەوەری تیایە بە نەوتی ڕەش (وەکو لە قەڵاچۆکردنی مێشوولەی ملاریا بەکاردەهێنرێت) دەبێتە هۆی خنکاندنی (لارڤاکان) چونکە ناتوانن هەناسە وەربگرن .

دووەم : قەلاچۆکردنی کیماوی (Chimical conctrol) ئەو ڕێگەیە تاکو ئێستا بە بڵاوترین و ناسراوترین ڕێگە لە جیهاندا دادەنرێ . لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە نەختێك دەربارەی ئەم ڕێگەیە بدوێن .

ئەم ڕێگەیە بریتیە لە بەکارهێنانی ژەهری جرو جانەوەر (Insectisides) . ژەهری جرو جانەوەر « المبيدات الحشرية » لە گەڵ ئەوەی کە خزمەتێکی زۆری ئادەمیزادی کردووە ، بەوەی کە توانراوە تا ڕادەیەکی زۆر قەلاچۆی جرو جانەوەری زیان بەخشی پێ بکرێت ، بەلام لە هەمان کاتدا بە ڕێگەیەکی پەسند دانانرێت لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسیان دەکەین .

١ ـ لە ڕەوشتە خراپەکانی ئەم ڕێگە ئەوەیە کە جرو جانەوەر بەرهەڵستی (مقاومة) (Resistance) بەرامبەر ژەهرەکان پەیدا دەکەن ، واتە بەکارهێنانی زۆر لەو ماددانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هیچ کاریگەریەك نەکاتە سەر جرو جانەوەرەکان و نەبێتە هۆی لەناو چوونیان .

بۆ نموونە ماددەی [ D.D.T ] کە کورتکراوەی ناوی کیماوی [ Dichloro Diphenyel trichloro ethane ] بۆ یەکەم جار ڕەوشتی ژەهراوی ئەو ماددەیە بە جرو جانەوەر زانرا لە لایەن « پۆل مولر » ساڵی ١٩٣٩ ، (لە ساڵی ١٩٤٨ پاداشتی نۆبلی پێوەرگرت) ئەو ماددەیە خزمەتێکی زۆری ئادەمیزادی کرد بە تایبەتی لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم بە بەکار هێنانی بۆ قەلاچۆکردنی ئەو جرو جانەوەرانەی نەخۆشی بۆ ئادەمیزاد دەگوێزنەوە وەکو مێش و مێشوولە و ئەسپێ . بەلام ئێستا لە کەم شوێن لە جیهانا بەکار دەهێنرێت ، بەڵکو لە زۆر شوێن قەدەغەیە ، چونکە زۆربەی ئەو جرو جانەوەرانەی لەم شوێنانەن کە ئەم ماددەیان لێ بەکارهاتووە بەرهەڵستیان بەرامبەری پەیداکردووە ، وە دەتوانن ئەو ماددەیە لە لەشیانا بکەن بە ماددەیەکی وا کە ژەهراوی نەبێت . وەك لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەندێك لە جرو جانەوەر وەکو مێش ئەنزیمی (Dehydro chloridase) دروست دەکەن بە هۆیەوە (D.D.T) دەکەن بە (D.D.E) کە مادەیەکی ژەهراوی نیە و هیچ کاریگەریەك ناکاتە سەر جرو جانەوەرەکە .



« D.D.T »



« D.D.E »

٢ ـ پیس کردنی دەورووبەر « تلوث البيئة » بەهۆی مانەوەی هەندێك لە ژەهری جرو جانەوەر بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ شی بوونەوە (التحلل) ، زیانێکی زۆر بە ئادەمیزاد دەگەیەنێت ، وەکو بەکارهێنانی ئەو جۆرە ماددانە لەسەر ڕووەك دوایی بەکار هێنانی بەروبوومی ڕووەکەکە ڕاستەوخۆ لە لایەن ئادەمیزادەوە یان ناڕاستەوخۆ لە لایەن ئاژەڵەوە وە لەوێشەوە لە ڕێگەی شیر یاخود گۆشت بۆ ئادەمیزاد ، ئەو ماددەیە لە ناو لەشی ئادەمیزاد دەمێنێتەوە و ورده ورده ڕێژەی زیاد دەکات تادەگاتە ڕێژەیەکی وا کە ببێتە هۆی مردن و لەناوچوونی مرۆڤەکە .

٣ ـ لە ناوبردنی دوژمنی سروشتی (الاعداء الطبيعية) بەکارهێنانی ژەهر دەبێتە هۆی لەناوچوونی جرو جانەوەری سوودبەخش ، وەکو ئەو جرو جانەوەرانەی لەسەر جرو جانەوەری زیان بەخش دەژین ، ئەوانەی ڕۆڵێکی گرینگیان هەیە لە قەلاچۆکردنی زیندەگی ، وەکو لەمەودوا باسیان دەکەین .

جا لەبەر ئەو هۆیانە و زۆر هۆی تریش پێویستە زۆر بەکەمی ئەم ڕێگە بەکار بهێندرێت ، وە ئێستا هەوڵی بەکارهێنانی ڕێگەی تر دەدرێت .

سێیەم : قەلاچۆکردنی زیندەگی Biological control (وەنەبێت ئەم ڕێگەیە بتوانرێت بەرامبەر هەموو جۆرە جرو جانەوەرێك بەکار بهێندرێت ، بەلام ئەو جرو جانەوەرانەی ئەم ڕێگەیان لە گەڵ

بەکاردەهێنرێ ، بە باشترین ڕێگەی قەلاچۆکردن دادەنرێت .
قەلاچۆکردنی زیندەگی : بریتی‌یە لە بە کارهێنانی ئەو جۆرە زیندەوەرانەی کە لەسەر هەندێک جرو جانەوەر دەژین بە شێوەی مشەخۆر (الطفیلی) یاخود (مفترس) (واتە خواردنی جرو جانەوەرەکە لەلایەن هەندێك لەم زیندەوەرانە) وە زیاد کردنیان و بلاوکردنەوەیان لە سروشت . ئەو زیندەوەرانە چ جروجانەوەری بە کەڵکبێت (واتە لەسەر جروجانەوەری زیان بەخش دەژی وە چ بەکتریا یاخود کەڕوو (الفطر) (Fungi) یان باڵندەبێت ، مەرج وایە نابێ خۆیان زیان بەخش بن .
ئەو ڕێگەیە بە چاکترین ڕێگەی تازە دەژمێردرێت بۆ قەلاچۆکردنی جرو جانەوەر بە تایبەتی لە وولاتە پێشکەوتوەکاندا .
من لێرەدا باسی هەندێ نموونە دەربارەی ئەم ڕێگەیە دەکەم
١ ـ جرو جانەوەری البق الدقیقی (حشرة البق الدقیقی) « Planococcus Vastator » یەکێکە لەم جرو جانەوەرانەی کە زیانێکی یەکجار زۆر بە هەندێك ڕووەك دەگەیەنن وەکو پرتقاڵ ، لیمو ، نارنج .. هتد .
ئەگەر سەیری دار پرتقاڵێك بکەین کە دوچاری ئەو جرو جانەوەرە بووبێت ، دەبینین جرو جانەوەرەکە بە شێوەی خاڵی سپی وەك شەمێ (مۆم) بە سەر دارەکەوەیە ، دەستدەکا بە مژینی ئاوی ڕووەکەکە تا وای لێدێت ڕووەکەکە لاواز دەبێت و بەرهەمی کەم دەبێت .
(لێرەدا بە هەلی دەزانم کە بڵێم کە ئەو جرو جانەوەرە پێش « ٢٥ » بیست و پێنج ساڵ لە عێراق نەبووە ، بەڵکو لە ڕێگەی هێنانی شەتڵ لە دەرەوەی عێراق هاتۆتە وولات) دیتراوە کە هەندێك جۆر لە جرو جانەوەری سود بەخش لە سەری دەژین ، وە بەکار هێنانیان دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ئەم جرو جانەوەرە ، بۆ نموونە جرو جانەوەری Exochomus nigrpennis کە جۆرە قالۆچەیەکە لە تاقیگە (مختبر) دیتراوە کە لە کاتی سووڕی ژیانی (٢٠٠٠٠) بیست هەزار هێلکەی البق الدقیقی دەخوات .. واتە زۆرکردن و بلاو کردنەوەی ئەم جرو جانەوەرە لە سروشت ڕێگەیەکی زۆر پەسندە بۆ قەلاچۆکردنی البق الدقیقی .

نموونەیەکی تر (خاڵ خاڵۆکە) « Epilachna » کە جرو جانەوەرێکی ڕەنگ پرتقالیە درێژی شەش ملم دەبێت وە لەسەر باڵەکانی حەوت خاڵی ڕەش هەیە بە دوژمنێکی سروشتی سەرەکی (حشرة المن) واتە (شۆکە) دادەنرێت ، زۆر کردن و بلاوکردنەوەی لەو کێڵگانەی کە ڕووەکەکانیان تووشی شۆکە بووین بە باشترین ڕێگەی قەلاچۆکردن دەژمێردرێت . وە زۆر جۆری تریش کە لێرەدا بواری باسکردنی نیە . بێجگە لە قەلاچۆکردنی جرو جانەوەر ، قەلاچۆکردنی زیندەگی بەکار دەهێنرێت بۆ قەلاچۆکردنی هەندێك ڕووەکی خۆڕسك (الادغال) کە زیان بەخشن . بۆ نموونە لە ئستراليا توانرا قەلاچۆی جۆرە ڕووەکێك کە لە جۆرەکانی (صبیر) ە بکەن بە هۆی بەکارهێنانی جرو جانەوەری . Cacto blactes Cactorum

* * * * * * *

١ ـ لە زۆر پەڕاوی قوتابخانەدا ناوی مێروو بۆ حشرە (insect) بەکار دەهێنن . من ئەم ناوە بەڕاست نازانم چونکە مێروو تەنیا (النمل) دەگرێتەوە ، کە جۆرێکە لە جروجانەوەر .
٢ ـ کوللەی بیابانی (الجراد الصحراوی) جۆرێکە لە کوللە کە بە قەبارە گەورەیەو بە شێوەی کۆمەڵ دەژین ژمارەیان یەکجار زۆرە ، بە دژوارترین دوژمنی ڕووەك دەژمێردرێت ، ژمارەی یەك پۆل دەگاتە چەند ملیۆنێك . ساڵی ١٩٦٧ لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست پۆلێك دیترا درێژیەکەی (٦٠) شەست کم کێلومەتر .

**سەرچاوەکان .**

1 — Herms Medical Entomology

٢ ـ مبیدات الآفات : تألیف الدکتور محمود زید ١٩٦٤ .
٣ ـ مقاومة الحشرات لمبیدات الآفات
تالیف الدکتورة أمیرە حسین طبوزادە
٤ ـ دلیل مکافحة الحشرات الضارة

# ماسیگری و هۆگرێن خابیری زاخو

ڤەکۆلین و بەرهەڤکرنا
احمد عبدالله زەرۆ

## ● پێشەکی ●

راستە چ مللەت دبێ بەهر نابن ژ کەلەپۆرو زانین و ئەدەبیاتا ، بێ بەهر نابن ژ کارو پیشەو هەر ئالەکێ دی ژ ژیانا رۆژانە ، بێ بەهر نابن ژ سروشتێ بەرفرەهو شەنگ و پڕ ژین . ئەگەر بێن و بەرێ خوە بدین سەرو بەرێ مللەتێ کورد ، چەوا شیایە کەلەپیرتەکێ مەزن هەر لسەر زارێ خەلکێ ، چاخ بو چاخ ژمەرا ڤەدگوهێزت و بهێلت ، شیایە گەلەك ئالێن دی ژی توماربکت و بچەسپینت .. لڤێرە وەسا شیایە ئالێن ژیانا گیاندارو رازو فرندا ژی دگەل ژیارا مروڤی ڤە گرێبدت و خویابکت .. شیایە ناڤ و ناڤدانێ بدتێ ب ئاوایەکێ جوان مینا جوانیا وەلاتێ کوردستانێ .. شیایە ژین و ژیارا وان گیاندارا لسەر رویێ ڤێ زەڤیێ و لژێر ئاخێ و دنێڤ ئاڤو روبارادە خویا بکت وەك مروڤەکێ شەهرەزایی ب زانستا بایولۆژی ڤە هەی و وەك زمانزانەکێ ناڤ بو دانابت و ببیتە سەرهۆستایێ فەرهەنگا کوردی ..

دڤی بابەتی و ڤەکۆلینێ دە من ئارمانجا هندێیە ئالەکێ ژ ژیاتا جوینەك گیاندارێن دنێڤ ئاڤێدە شروڤە بکم لدویڤ بارێ زانینا من و هۆگرێن بەر دەراڤ و لێڤێن خابیری و جۆم و جەلالا ژی لتەڤ دەمێن سالێ .. هەر وەسا من ب پێدڤی دیت ئەز ئالەکێ گەلەك گرنگ شروڤە بکم ، ئەو ژی دبابەت [ ماسیگری و شوکڤانی و جوین و بڕبڕێن وان و ئامیرێن شوکڤانیێ و هۆگرێن ناڤدێر ژ خەلکێ زاخو .. ]

لهێشیێ ، خابیرێ زاخو وەك نمونە بو هەر روبارەکێ دی ل کوردستانێ ، دێ سەرنج و دەست نیشانێن شەهرەزاو هۆگرێن وێ ، دێ کینە ژێدەرو سەروکانی ژبلی هندەك پەرتۆك و گوڤارا ژی هەر بو ڤی بابەتی دێ هینم .. پیرەمێرو شوکڤانێن ماسیا لبەر لێڤێن روبارێ خابیری ، هەر ژ کەڤندا ، ئانکو ژ کەڤناریا باژارێ زاخوو هەتا نها هەبون و هەنە دگەل خابیری ژیاین و پویتە پێکرین و ژێ دیتین ، ژێ خوارین ژ خوشی و نەخوشی یا .

لبەراهیێ ، روبارێ خابیری ، روبارەك تەنگ و خۆرتە هەر ژ سەروکانیێ و هەتا دگەهتە زاخو ، پاشینکێ ب [ ٣ ـ ٤ کم ] دگەهتە روبارێ هیزلی و ڤێکرا دگەهنە روبارێ مەزن [ دیجلە ] ی ل گوندێ پێشخابیری .. خابیر زاخو پارڤە دکت بو سێ ئالا و پارچا ، نیڤا باژێری وەك گزیرتەکێ لێ دهێت .. هەر وەسا روبارەکێ وەرچەپ و ب پێلە ، خۆرتو دژوارە ل

دەمێت زفستانێ و بهارێ چاخێ ئاف ڕادبت ، بۆشێنا ئـافێ خەلكێ سەوداسەر دكت ، نەخاسمە ل ئـاف ڕابونێ قـورم و قافوكا بەر لێڤا پڕ دكت .. ڕابونا ئافێ [ لێمشت ] ل خابیرێدا گەلەك جارا وەك بافو باپیرو كالا دگوتن و هـەتا بـەرێ سیهـ سالا ، بووە ئەگەرێ هندێ بسەر پرێت زاخودا بگرت ، شیایە خۆ بكێشتە دنێف كۆلك و ئاڤاهیێن دنێف بازێرێدەو هەرڤاندنا وان ..

لڤێرە پرسیار دكم و دبێژم ؟ بۆچی هند خەلكێ ئاكنجی دنێف بازێرێدە دگرێداینە بڤی روبارێڤە ؟ ژبلی هندێ بێژین ڕاستە ژیان هەر ئەوە لدوریێت ئافا بن ! چ كانیك و جەلال و جۆم بن چ روبار بن .. وەیە جیهانا ڤێ زەڤیێ دبێ ئاف نابن و نازین ، بۆشاتیا ئافێ دبتە ئەگـەرێ ژینەكـا خوشتـرو بەرفـرەهتر ، شینكاتی گژ دبت ، گیاندارو فرندە پڕ دبن .. لەورا ئافەدانی ژی ب ڕەوش دبت .. ژبلێ هندێ دبیتە ئەگەرێ پێ مژویلكرن و بوراندنـا چاخـێن خوەش . لڤێـرە دەست پێ دكە دەركـەهێ بابەتیێ و دا بچینـە ژورێ و ببینین جیهـانەكـا دی .. جیهانـا ئەناهی و بێ دەنگیێ و ئارامیێ .. جیهانا ماسیاو گرتنا وان .

[ مـاسی و جوینێت وێ د خـابیرێدا ] ژبـو سەرهـاتیا ماسیا ، بو جارا ئێكێ ماسی ل دەریایێن مەزن پەیدا بین بەرێ (٣٠٠) ملیون سالا ، گیانداریێت ئەنتیكە بـین ، لێ لچاخـەكێ دویردا بریان ، ئەوژی بنیادێ خۆرستی بین بو ماسیێت نها ئەم دناسین .. وەدیارە سروشتی پتـر ماسی ڤیـایە ژنێف هـەمی گیانداریێت ب پەراسی لەوا ژ هەمیان پترن و مشەترن .

زانایێت بایولۆژی ماسیا ب هژمـارەكا مـەزن دناسن و پتـر ژ [ ٢٠٠٠٠ ] هزار جوینا دبینن .. دەما ژیان گەهشتیە روییێ ڤێ زەڤیێ هندەك ماسیا بەرێ خوە دان روبارو دەریاییێت بچوك و هندەك دی ژی چەند دەمێت خۆ دبوراندن دنێف دەریاییێدا و چەندەك دنێف ئافا شیرینێدا . لێ ٣/٥ ژ هەمی جوینا دنێف دەریایادا مان ، ئانكو ئەڤ هژمارە گەلەك پترن ژ وان جوینێت دی ئەوێن ماین[١] . ئەگەر بێن بەرێ خوە بدین مـاسیا دنێف ئافێدە وەسا سەرنجا مە دهێتە ڕاكێشـان بو دو بـرا یان دو كۆمەلا :

**(١) ماسیێت پڕ لڤین ـ بەزوك ـ**

**(٢) ماسیێت كێم لڤین ـ نەبەزوك ـ**[٢]

ئەڤە ژی دبتە ئەگەرەك بو جوینێت گرتنا وان .. هەر وەسا ژی ئەم دشێن ماسیێ بكینە دو گـروپ ژلایێ لەشێڤە ب تـایبەتی ژلایێ كەلەخێڤە :

**(١) ماسیێت ب هەستی (ئیسقان)**

**(٢) ماسیێت ب كركرۆك**

جوینا دوێ پتر دنێف دەریادا دژین و د روبارادا هەمـا پەیدا نابن لەوا خوارنا ماسیێت روباری بترسـە ژبەر پـریندیا هەستیا دنێف گوشتێ وێ دا .

ڕێزكرنا گروپێت ماسیا بڤی ئاوایی دێ داڕێژم هەر ژبونا وان و هەتا مەزن دبە .

لهێشیێ ماسی ئافێ پڕی (خەرز) دكت ب ملیونا لێڤ و بەرلێڤا دنێف خیزولیمێدا پڕ دكە .. لێ كێم ژوی خەرزی دمینت چونكە بـڕاستی هەر ئـەو بخوە دبتـە (تملۆك ـ تۆمـك) بـو مـاسی و گیانداریێت دی .. ژڤی خەرزی (ماسی هـویرك) پـەیدا دبـە درێژیا وان ژ [ ١ ـ ٢ سم ] انە ، سەروبەرێ ماسیێ خـوێ نابە هەتا دگـەهتە درێـژیا [ ١٥ ـ ٢٠ سم ] ئـەڤجا دهێتـە ناسین ـ

● **ماسی شینك** :

ئەڤ ماسیە زراڤ و درێژە ڕەنگێ وێ بسەر شینی ڤەیە ، لەوا دبێژنێ [ ماسی شینك ] دەڤێ وێ مەزنە ، بنزك سپییە هەمی دەما كۆم ـ كۆم و سەر ئافن .. پڕ بەزوكن ، لبەر لێڤێت روبارادا دژین .. دەمێت بهارو هاڤینا پترن .

● **ماسی جهیك** :

ماسیەكا كورتە ، ب سمبێلە ، بنزك ڕاست و حولیە .. سـەر ژ كەلواشی مـەزنترە .. هـەمی دەما بكـەڤرو بـەراڤە دنیسیت ، لڤینـا وێ هەر لسـەر زكیە .. كێم بسـەر ئـاف دكەڤت .. هەمی دەما دجهدایە لەوا دبێژنێ [ جهیك ] ژ پەیڤا [ جهـ ] دگەل پاشپرتا [ یك ] بوە جهیك .. ئەڤ ماسیە مەزن نـابیت ژ ١٠ ـ ١٢ سم درێژتـر نابت .. كـەس گـوشتێ وێ ناخۆت ، سەر ژ كەلواشی مەزنترە .



● **دۆمبەك ـ بلقي** :

ماسیەکا خڕو داگرتییە بسەر سپیڤە دچت دەمـا خۆ دتەبیسینت بکەڤراڤە .. پڕ پیلەکێت هویرن ، دەڤ بچویکە ، هەمی دەما بڕ بڕ پەیدا دبن لبەر لێڤێت ئاڤـا لدورێت کەڤـرو قلیانا ، بتایبەتی لدوماهیکا هەیڤا گولانێ و لهاڤینا دمشەنە . ماسیەکا پڕ جڤۆکە .. ئەڤ ماسیە ژ گروپا ناقورانە ـ Cyrionoidei بتایبەتی بسەر ماسێیت Buffaslos ڤـە دچت ژ کۆمـەلا ئێکێ ، لئەمریکا ژوری دمشەنە[٣] .

● **ماسی زەرك ـ زەردۆلە ـ**[٤] .

ئەڤە ژی هەر ژ بنەمالا ناقورانە ، بسەر زەریڤە دچت .. پتر لدەمێت بهارا دمشەنە دنێڤ جەلال و روبارادا و وەما لێمشت وهێنە خارێ بەرەو نزارو دۆل و نهالا ، ئاڤ شێلی و گەولی دبە ، ماسی دبنە قەرس خەلك بساناهی ب تـورك و سەلکـا دگرن . ماسیەکا پڕ هەسیتە .. لەشێ وێ سستە ، ژبەر هندێ ماسیگر زوی پاکژ دکەو نەخاسمە ژ هناڤا چونکە زوی رەنگێ وێ پێتی دبت ئەگەر نەهێتە براشتن یان قەلاندن .

● **بیك ماسی** :

ئەڤ ماسیە وەك دۆمبەکانە بەلێ بنگوهێت وان دسۆرن بێ سمبێلن ، پەحنن ، پیلەکێن وانا دهویرو نەرمن ، شینەکێ زەلالە ، خیچەکا سپی هەر ژئەنیێ پێڤە هەتا ژ هەردو ئالا بو شاپەڕا دیڤکی کێشایە .

● **ماسی خیسك** :

ئەڤ ماسییە ژی هەر ژ بنەمالا نـاقورانـە ، لێ کەلەخ بچوکترە ، هەرگاڤ سەرولەشێ وێ دنێڤ خیزو لیمێ دایـە ، ماسیەکا جڤوکە ، گەلەك جارا بنێ ئاڤێ تێکڤە ددت و شێلی دکت هەتا ڕەنگێ بـدت بنێ ئاڤێ و خـۆ بڤەشێـرت ، ماسیـەکا بێ سمبێلە .

● **ماسی بەحریك** :

هەر چەندە ناڤێ وێ ژ پەیڤا « بەحرا » عەرەبی هاتیە ، بـەلێ ئەگـەر ژێ ئەوە ڕەنگێ ڕەشـو تاری ، چـوار جـوینێت سمبێلا ، پشت مشارەو سەر ژ کەلەخی مەزنترە ، مـاسیەکـا ئێکانەیە دروباراوا بڤی رەنگو بەرگی و بڤی ئاوایی و لدیف چ برێت دی ناهێت و بسەرڤە نینن . ماسیەکا دژوارە ، پڕ هێـزە هەر چەندە قوت و پڕ برەکە ، ماسیگر هەر خوە ژێ ددتە پاش دەما دگرت چونکە بهاریکایا سمبێل و شاپەڕا پشتێ دەست و تلا وبرت دەما بێتە گرتن . دبێژن ژەهرکریە منیا هندەك ماسێیت بەحرێ .. کەس گوشتێ وێ ناخوت ، ژ بـۆ ستەکێ دریـژتر نابت .

● **بزویری** :

ماسیەکا خڕو داگرتییە ، ژبنەمالا ناقورانە ، پڕی ڕونە گەلەك بیهایە دخوارنا خوەدا ، ژهەمی ماسیا ب چێژترە ، هەتا ٢٠ سم ب درێژاهیێ ، ب کەلەخێ خوڤە مینا ماسی زەرکێیە ، ڕەنگێ سۆرێ ڤەکری بسەردا تێت ، خەلك حێبەتی دمان دەما مروڤەکی بزویریەك گرتبا .

● **قژاژ** :

ب ئنگلیزی دبێژنێ Tratta بسەر ڕەنگێ مێکاڤە دچت ، لێ کورتترە ، دەڤ مەزنە ، پیلەکێت وێ دمەزنن زراڤ و درێژە ، بەلێ ژ ٢٠ سم پترنابت ، بسەر سپیڤە دچت .

● **كارسيل** :

ئەڤ هەر ژجوينا ماسيا Buffalos ڤــە دچت ، رەنگێ وێ بسەر رەشی ڤەیە ، كێم لڤينە ، هەردەم سەرێ وێ دنێڤ لێمو خيزی رایە .. ماسيگر هەردەم ب هلكێشانێ (خــطف) دگرن چونكە خــوارنێ ژ دەڤێ نكلوكی ناخــوت ، مروڤی بێ ئــارام نەشێت دەمێت خۆ دگەل دبورينتو بگرت ، چونكە ماسيــەكا دلنێشــە ، ناهێت شــوكێو خۆ بســەرڤــە نــابت ، خــرە وەك دومبــەكێ ، ئەوژی بنێ ئــاڤێ شێلو بێــل دكت دەما دلڤتو دبەزت وەلێ دهێت رەنگێ بنێ ئاڤێ بگرت دا كەس نەبينت .

● **ناقوّر (الكطّان)**

ب عــەرەبی دبێژنێ « الكـطّان » . دریــژاهيــا وێ دگــەهتــە مێترەكێ ، ماسيەكا ژ هەمی جوينا بناڤو دەنگترەو پر بهاترە ، ب سمبێلە ، داگــرتيــە ، پيلەكێت وێ دنــاڤنجينــە ، دەمێت زڤستانو بهارو هاڤينا دبرن ، پتر دەمــا ئاڤ رادبت ، جــوّمو جەلال پر ئاڤ دبن دگەل ماسی زەركا دهێتە گرتن ..

● **مێك** :

ب عەرەبی دبێژنێ « الشبوط » ، براستی هەر ژ ڤی ناڤی جهێ پرسيارو هزركرنێیە ! ئەڤ ناڤێ كەڤنادو ژمێژ همبەری ناڤێ بالەفرەكا شەرکەرا روسی « مێگ » وهاڤلی پێكڤە هەنە يان نە ؟ چونكە وەك من پرسیو پشت راست بيم ژ رامانا پەيڤا مێگ د روسیدە بڤێ واتايێ هاتيە « مێگ ـ MEG » ب تــايبەتی بــوی كەسیڤە نافكريە ئەوێ كەلەخێ ڤێ بالەڤرا شەرکەر سازكریو نەخش ژێرا كێشایو چ مەبەستەو ئەگەرێت دی نادن ، بتنێ ناڤێ كەسێ سازكری كو ناڤێ دی (ميكويان)(°) بی هاتيە وكورتە ناڤێ وی (مێك) بناڤكريەو ب نەبزوێنا (ك) دروست هاتيەو نە ب نەبزوينا (گ) ێ يە .

ســەروكێ مێكا ئەوێ لپێشيا وان دكــەڤت دبێژنێ مێكــا (سەرجەلەب)

● **شقلە** :

ئەوژی هەر ژ بنەمالا مێكانە ، لێ زراڤو درێژە ، دەڤ مەزنە ، پيلەكێت وێ دپەحنو مەزنن . پتر لدەمێت هاڤينا خوّیا دبن، هەردەم بسەر ئاڤ دكەڤن ، خوەرێ وان وەكی مێكا ل هاڤينا پتر لسەر ڤێڤیو دەرامەتیيە ژبلی خوارنا سەرەكی كو لسەر دژيت دنێڤ كەڤرو ماسیێت هويردا .. بعەرەبی دبێژنێ « بنّی » وب ئنگليزی دبێژنێ [ Burbus ] .

● **فەرخ** :

ب عەرەبی دبێژنێ ـ البُزّ ـ ماسيەكا گەلەك مەزنە ، ئەز دشێم بێژم مەزنترين ماسيە دروبارادە ، بسەر سپیڤە دچت ، ماسيەكا داگرتیيە .. سەرەك مەزن هەيە ، دەڤ مەزنە ، ب سمبێلە ، ژمێترەكێ درێژترە ، ل گەرو ئاڤێت پەحن دمشەنە .. ناهێنە بەر لێڤێت ئاڤا لەوا ماسيگر شوكا خۆ دور دهاڤێژن ب نكلوكێن مەزن دهێنــە گرتن ، خــوارنا وێ ژی هــەر گوشتو جگەرو تحێلو ماسينە .

● **چەور** :

ئەڤە تێشكا فەرخیيە .. هەر ب پــەسنو سەروبــەرێ فەرخی ڤە دچت .

● **دو شەتيك** :

وەكی ماسی شينكێيە بەلێ پا مەزنترە و ب كەلەخترە ، ئەڤ ماسيە دبنێ ئاڤێدە دژيت بــەروّڤاژی مــاسی شينكێ كو هەردەم بسەرئاڤ دكەڤن .

● **مارماسی** :

بعەرەبی دبێژنێ ـ السمكــة الأفعی ـ ئەڤــە ژی ب رەنگەكێ بەرفرەهــ دئاڤێدە دژين نەخاسمە دروبارو دەريادە ، زراڤــو درێژە دگەهيتە ٤٠ ـ ٥٠ سم « پشت مشارە » ئانكو شاپەرێت پشتی بسيخمەنە .. سەرێ وێ مينا مارییە ، ژنيڤەكێ هەتا شاپەرا پشتێ وەك ماسيێيە ، لێ ژێهــەل هەتــا سەرێ مينــا مارییە لەوا دبێژنێ مارماسی ئانكو نيڤ نيڤەيە ، بومسلمــان گوشتێ وێ ناخونو دبێژن حەرامە وەك بيروباوەرێت ئايينی .. لێ فەلە دخون .

**[ ئاميرەتێن ماسيگرتنێو چەوا دگرن ؟ ]**

دگەل سادەیيا ژينو ژيارا مللەتێ كورد دگەل سروشتیدا و داخازا ژيانێ ببو ئەگەرا هندێ مروڤێ كورد شيايە گەلەك هزرو بيرا بكەت ژبو گەهشتنا مەرەما خوە . لەوا دبينين ئاميرەتێن ماسيگرتنێ دســادەنە وەكی هــەر ئاميــرەتەكێ دی ژبــو هەر ئالەكێ دی ژ ژيانا روّژانە ژپيشەو كارو بارێ مالێ . پەيداكرنا بەهرا پتــر ژ ئاميــرەتا هــەر ژ تشتێن بــەردەستو پێشچاڤــە

ماسی‌گرتن بەری ڤی چەرخی ئامیرەتێن سادە بکار دهێنان هەر چەند رەنج و شیان بێ دڤیا لێ وەک دزانین نێچیر ژیان و خوشی‌یە یان مەرەقە ئانکو پر چێژتنە .

**(١) سیت :**

ڤەدانا سیتا نەخاسمە درووبارادە رەنج و شیانەکا لەشی دڤێت ، لەوا دبنیین ڤەدانا وان ب رێزکرنا بەرا ، چێکرنا سەلّکا ، پترژ ئاڤاهیەکێ رەنجدان بێ دڤێت ، چونکە ماسیگر هەردەم د ئاڤێ‌دایە ، پشت خویلە ، لەوا لپیراتیێ دبنە پشت کورک ـ خویل ـ ژبەر رەنجا سالان . سیت ژی لدیف پانی و درێژیا روباری‌یە ، چەند پان بت پتر سەلّکا دگرت ژبو گرتنا ماسیا . چونکە لناڤبەرا هەر (١٠ م) دەهـ مێترا سەلّکەک دهێتە ڤەدان ، هەتا پەحناتیا روباری دهێتە گرتن و دا ماسی چ رێکێت دی نەبینت بو رزگاربونێ ، بلنداهیا سیتێ ژ لیڤا ئاڤێ بگرە دوو مێتر بلندی دڤێت . ژ سیتێن ناڤدێر ل خابیرێ زاخو هەر ژ سالێن ١٩٣٠ ز و هەتا سالێن ١٩٦٠ سیتا رەشوکەرویە ، خوەیێ وێ هەر لسالا ١٩٥٧ چوە لبەر دلوڤانیا خودێ بەلێ پاسیت ما بو هەتا سالا ١٩٦٠ .

**(٢) شوک**

ژ هەمی جونێت ماسیگرتنێ بناڤو دەنگترە چونکە هەرکەس دشێت (شوکا) بەرهەڤ بکت و بێ بگرت هەر ژ بچوکان هەتا پیرەمێران ..

شوک پێک هاتیە ژ دەزیەکا موکم ، دەزی ژی گەلەک رەنگن :

أ ـ ژ بو بچوکان دەزیەکا زراڤ و دەنبوسەکا چەماندی و بچەک هەڤیری .. بو گرتنا ماسیێت هوریر یان دومبەکا یان ماسی شینکا .

ب ـ ژبو گەنج و مەزنان سانتینەکا موکم دگەل نکلوکەکا لدویف کەلەخێ ماسیێ و هەڤیرو کرم و جوبرو ماسی هوریرک بێ دڤێت ژبو خوەرێ ماسیێ و گرتنا وێ .

جـ ـ تەبلک : دەزیەکا وەریادایە ، ستویرەو هەر ژ سانتینی سازدکن تایبەتی بو گرتنا ماسیێت مەزن مینا فەرخ و جەورا و تاقورو مێکا . پەبلک گەلەک درێژە چونکە بو نیڤا روباری‌یەو یان گەڕایە .

د ـ **مێیت هەسپا** : بەری سانتین پەیدابیت خەلکێ بەرێ داڤ ژ کوریا هەسپا دکێشاو گەلەک جارا خودانی جوتک دخوارن هەتا شیابا گلەکا ژێ ب هیلکێشت ، پشتی هنگێ ماسیگری سێ ـ چوار یان پێنج داڤ ددانە هەڤ و گرێک ددانێ هەتا دبو (٦٠ ـ ١٠٠) داچێت گرێک کری پێکڤە دبەستن و دبوە داڤەکا درێژو نکلوکەک مەزن پێڤە دکرن دگەل دو سێ بەرەکێن بچوک نێزیک نکلوکی پێڤە گرێددان هەتا گران بباو نکلوک لجهێت ب پێل بنئاڤ ببا ..

بەلێ پشتی ترومبێل پەیدابین و خەلکێ بەرێ خوە ددایە تایرێت وانەو داڤێت سانتینێ ڤێرکری ژ نێڤ تایرێ دهلکێشان و گرێددان پێکڤەو دبوە شوکەکا موکم بکار دهینان بو ماسیگرتنێ .

**تێبینی** : هەر شوکەکێ بەری نکلوکی چەند بەرەکێن بچوک یان چوار پێنج پارچێت تەنکێن رصاص پێڤە دبەستن هەتاکو شوک گران بیت و بنئاڤ بیت .

شوکا نایلونی : پشتی دەرکەتی خەلکێ بەرێ خوەدا ڤی رەنگی چونکە حولی‌یە ، دبێ گرنکە ، چولکە گرێک پەسنەکا نەباشە ژبو شوکێ هەردەم ماسیێت سەرئاڤ وەک دومبەکاو ماسی شینکا « ترک » لێ ددان و ماسیگر بێ تورە دبی و چونکە هەر دەم دکێشا بهزرا گرتنا نێچیرا خو بەلێ ددەرکەت ڤالاو چوننە .. نایلون ژی ب گەلەک رەنگانە چ زراڤ و ناڤنجی و ستویر ماسیگری لدویف نێچیرا خو نایلون بکار دهینا . هەر وەسا نکلوک ژی لدویف کەلەخێ ماسیێ و هێزیا وێ بکار دهینا .

**(٣) تورک ـ الشباك ـ**

**(أ) تورکا گروڤر : (خڕ)**

**ئەڤ تورکە ژی دو جوینن :**

١ ـ دەڤەک گروڤر هەیە ب دارەکا درێژ (٤ ـ ٥ م) بێ دهێتە راکرن و بەردان دنێڤ ئاڤێ‌دە بتایبەتی ل جهێت ئاڤ دبتە زڤرەک کو ماسی دبنە ڤەرس و خو ژ پێلێت دژوار ددنە پاش و خو دکێشنە جهێت مەیاڤ و زڤرەک .. ماسی ب تورکی‌ڤە دمینت ، ئانکو شاپەرێت ماسیا دکەڤنە داڤێت تورکی .

٢ ـ تورکێ لشونا داری تەبلکەک سانتوینێ ستویر بکار تێت بنێت داڤا رساس کرینە هەتاکو تورک بنئاڤ ببت ، دەما دهێتە

کێشـان « دەڤێ تۆرکی دهێتـە ئێك » و مـاسی تێـدا دمینن و بشاپەڕا دهێنە نویسین ب تۆرکیڤە .

٣ ـ تۆرکێ پەحن و درێژ « ڤەبرك ـ قاطوع » : ئەو جوینە یێ کو ماسیگر هەردو دەراڤێت روباری دهێتە گرتن و ڤەبرك دمینتە ڤەدای دئاڤێدە هەتا دەم رۆژەکێ و ماسیگر دکێشتەڤە و ماسی بشاپەڕێت پێڤە دنویسن و دهێنە گرتن .. ئەڤ رەنگە ماسیگرتن مشە بەلاڤە لتەڤ جیهانێ . بو نیشانا ڤی تۆرکی چەند پارچێت دەپا بسەرڤە گرێدداینە و بسەرئاڤ دکەڤن هەتا خەلك بزانن ئەڤە جهێ ڤەدانا تۆرکێیە ..

**(٤) تەرحە :**(*)

ئەڤە ب هاریکاریا کەلەکەکێیە ـ ئانکو نها کەلەکێت سەر چۆپا ـ ماسیگر ڤەبرکا ـ قاطوع ـ ا خۆ دهاڤێتە روباری و هەر ڤوناغەکێ دکێشتەڤە و ماسیێت خۆ ژێڤە دکت و جارەکا دی و سێ جارکی هەتا (١٠ ـ ٢٠) جارا هەر تۆرکی دهاڤێت و دکێشتەڤە هەتا دویر دبیت ژ بازاری ..

**(٥) ماسیگرتن ب دەرمانی :**

دەرمانی چەوا چی دکەن ؟

هەر ژمێژو هەتا نها دەرمانەك هەیە تال و زراڤە ، هندی لبا نوکێ دهێت ب کەلپکە .. دهێتە شکاندن و نیڤەکـا وی وەك دیندکـا گوهیشکێیە .. ماسیگر دهینن وان لبا هویر دکن وەك ئاری و دگەل ئاری تێکەل دکن ، پاشی هـەڤیرەك ویـرا چێدکن بەلێ نەکەلەك روهن بت .. لدیڤرا وی هەڤیری دکەنە رژدەو سەرتیژ دبن .. ئەڤ رژدەیە دمینت لبەر تاڤێ هەتا هشك ببت ئەڤجـا بکار دهینن بڤی ئاوایی :

ا ـ یان رژدێ دکەنە لەشێ کرمادا یان گوشتیدە .

ب ـ رژدێ بـو هندەك مـاسیا دکـەنە د لبێت تـری و ڤالکێت گوندورادە .

پـاشینکێ لپـەحنـاتیـەکـا مـەزن دروبـاریدا ڤی دەرمـانی بەلاڤەدکن و دهاڤێن هەتا چاخێ (١ ـ ٢) سەعەتا بسەرا بچت ماسی بسەر ئاڤێ دکەڤن چ هویر چ گرو رەنگێ ماسیێ زەر دبت ژبەر کارتێکرنا دەرمانی د لەشێدە . مەلەڤـان ژی دچنێ چ بدەست و سەلك و تۆرکێت بچویك .

**(٦) ماسیگرتنا ب چراك و روناهیێ :**

دەم شەڤێت هاڤینا گەنج و تولاز دکەڤنە بەر لێڤێت خابیری و ب چراك و روناهیا هەیڤێ دچنە ماسیا ، چونکـە ماسی لشـەڤێت روناهی خۆ ددنە بەر لێڤێت ئاڤاو بکەڤراڤە کۆم دبن .. ژبـەر روهنیا گەش ماسی دجهدا دمینن و نالڤن ، لەوا ب سانـاهی ماسیگر ب (خەرتاڤێ) دنێڤ ئاڤێدە دهلکێشن و دگرن .

**(٧) ب هلکێشانێ و خەرتفاندنێ ـ ب شوکا ـ :**

ئەڤ کارە بتایبەتی دگەل ماسیەکا نەلف دهێتە کرن ، ئەوژی ماسیا (کارسێل) ە ، ئەڤ ماسیە دشێت دەمێت درێژ هەر لجهێ خۆ رابوەستیت و نەلفت ، ڤێجا گەنج و جحێل خۆ یێ مژویل دکرن ب هلکێشانا ڤان ماسیا بهاریکاریا شوکێ و دو ـ سێ نکلوکا پێڤە .. براستی دڤیا مروڤێ هۆ بهێن فرەهـ بیت ، چونکە ماسیگرتنەکا دلێشە ، دبیت سەد جارا شوکێ بکێشی بەلێ چ پێڤە نەهێت لەوا هەمی کەس هێزو تاقەتا ڤێ چەندێ نینن .

(٨) لڤێ دومـاهیکێ هندەك گـەنـج هـوی ببـون هنـدێ کـو کەهرەبایێ بکار بینن بو گرتنا ماسیا .. ئەڤ رەنگە ماسیگرتنە براستی کارەك نەد جهێ خۆدایە وەك دەرمانی چونکە هویرو گر یێ دمرن د ئاڤێدا .. ئەڤە ژی ب وایرەکا دوو سەر (گەرم و سار) ساری دبرن ، گەرمی ب کۆمەك تێلاڤە دبـەستن دنێڤ ئاڤێدە ، دگەل هێزا کەهرەبی دگەهیتە تێلا بهاریکاریا تەراتیا ئاڤێ دبیتە کونتاك ـ ماسی لدورا یێ دکەڤن و دمرن ـ سەرئاڤ دبن . ئەڤ رەنگە ماسیگرتنە و دەرمان هاڤێتن پێدڤی « میری » ڤێ چەندێ نەهێلت چونکە دبیتە ئەگەرێ کوشتنا هەمی رەنگێت ماسیا ب هویرو گرڤە .

## [ ماسیگرێت خەلکێ زاخۆ ]

براستی من ب پێدڤی دیت ئەو کەسێن کارو بارێت دخوە کرینە ماسیگرتن .. شەڤـو رۆژا ژی بوراندین دگەل خابیری و بنەمالێن وان هەتا نها لدیڤ دەوسا بابو باپیران دچن دڤێت ئەم وان ژبیر نەکەین .. چونکـە یا راست ئـەوە ئەڤـە ژی کارەك خۆمالیە و بارەکێ فولکلوریە .. هەر چەندە ژی و ڤەژین ژی لدیڤرایە .

**١ ـ رەشو کەرو :**

ئەڤە بناڤو دەنگ بو هەر ب ناڤێ « سیتـاخۆ » ، سیتـا رەشو کەرو ، جهێ سیتا وی لسەر خابیرێ زاخو لسـەرێ بازاری و

دبن پرا مەزن‌دا « دەلالی » ڤەدای بو ، ئەڤ سیتە پێك هاتبی ژ (٦ ـ ٨) سەلکێت ڤەدای هەر ب پەحناتیا خابیری ، نها شینوار نەماینە ، لێ هەتا سالا ١٩٦٠ ز مابو ئەڤ سیتە .. لسالا ١٩٥٧ چو بەر دلوڤیانیا خودێ .

**٢ ـ توفیقێ ئەحمد میرازی :**

بابێ (حمدي‌و صلاح‌و عمرو مهدي علي) یە ، مروڤەکێ رەزڤـان بی بەلێ پتـر ژیانـا خۆ لبـەر لێڤێت ئاڤێ دبـوراندن نەخاسمە خودان (شوك) بی‌و لمال هەر دەرمان چێدکرن و هەتا نهـا ژی کـورێت وی دەرمـانی بکـار دهینن .. کـورێ وی (صـلاح) ی خودان ئیجـازەکا رەسمی‌یـە « ماسیگـرەکێ » رەسمی‌یە ئیجازە ژ پارێزگەها میسل وەرگرتیە . لسالا ١٩٨١ بابێ وان (توفیق) چو بەر دلوڤانیا خودێ .

**٣ ـ بنەمالا (صدیقێ) چایچی :**

ئەڤ مروڤە ژی ماسیگرەکێ ب حنر بی پـر ژینا دنێڤ ئاڤێ‌دا بوراندبی‌و ماسیگرەکێ ناڤدێر ب تایبەتی شـوکڤانی‌و ماسیگرتنا ماسیێتە مەزن‌و جـەورو ڤەرخـا . ئەوژی هـەر ژ سالێت هەفتێ چوە بەر دلوڤانیا خودێ .

**٤ ـ قادو ێ حەممال :**

ئەڤ ماسیگرە ژی نەمایە هەر وەکی هەڤالێن پێشین بوی رەنگ‌و ئاوایی ماسی دگرتن .

**٥ ـ ئیسڤێ عەلی « گولوکێ » :**

گولوك ناڤێ دەیکـا وی‌یە ئـانکو ژ نـاڤێ (گولێ) وەرگـرتیە ، بـراستی ئەڤ مـاسیگرە هێشتـا ساخـەو دژمیتن ، ئـەوژی ماسیگرەکێ بناڤو دەنگە لزاخۆ .

**(٦) کەسپەر ـ بابێ ئەندریوسی : ـ**

مروڤەکی فەلە بو ، پر ژینا خۆ [illegible] ێ دە بوراندبو ، چونکە گەلەك شەیدایێ خابیری بوو چ [illegible] ن ژبلی ماسیگرتنێ .

هەر وەسا ب سەدا کەس هـەبون‌و هـەنە بڤی رەنگـو تەرزی کارێ خوە کربین ماسیگرتن وەسی :

نوریێ شێخ غنی‌و عەلیێ مێرەماو فەخریێ شوفێرو ئیسڤاغا خودانێ گەرا خۆ خەلکێ دگوتنێ گەرا ئیسڤاغای دەما خابیر دگەهتە نێك‌ڤە لبنێ باژارێ نێزیك ئاشێ چەمی .

**ژێدەدو فەروز**

(١) كل شيْ عن البحر ـ زنجيرا ـ ١٦ ـ دانانـا : فردينـانـد لين ، وەرگێرانا د. محمود محمد رمضان .. ل / ٨٤ .

(٢) عالم الاسماك ـ عبدالعزيز محمود ـ چاپا / القاهرة ـ ل/١٢.

(٣) الثروة السمكية / مجلة علمية / ژماره (١٠ ـ ١١) /١٩٨٥ ، ل ٦٤/ .

(٤) فەرهەنگی خاڵ / محمدی‌خاڵ / جزمی سێیەم / ١٩٧٦ .

(٥) بو ڤی بلبەتی من پرسیار ژ برادەر احسان شێخ موسای کر کو ئەندازیارەکی نەفتی‌یە دەرچویێ روسیایەو پتـر ژ (٨) سالا ل روسیا مایە .. بەرسڤا وی من کرە بەلگە بو ڤێ مەبەستێ .

(٦) فەرهەنگی زانیاری وێنەدار : دانانا کمال جلال غەریبی /چاپا ـ ١٩٧٥.

(٧) هەر وەسا من قلزانج ژ دو هـژمارا ـ بـەرگا ـ ژ گـوڤارا مجلة المعـرفـة ژمـاره ٣ ـ ل ٥٣٤ ـ ٥٣٥ ، ٥٣٦ و ژمـاره ٤ ـ ل ٧١٢ ، ٧١٣ ـ ل /٦٣٢ ـ ٦٣٣ کری‌یە .

(٨) ژبو ڤێ ڤەکولینێ من سوود ژ برادەر صلاح توفیقێ احمد میرزای کو خودان ئیجازەکا رەسمی‌یـەو شەهـرەزایە دڤی بـابەتی‌دا وەرگرتیە .

ـ قەرس : دەما روبار شێلی دبت یان سر تێت ماسی کوم دبن ـ دبێژن قەرسا ماسیایە .

ـ لێمشت : ئاڤ‌رابون ـ بەلێ لێمشت کێمترە ژ ئاڤ‌رابونێ ، لەیی .

ـ شاپەر ـ زعانف ـ زعنفە ـ

ـ پیلەك : کەڤلکێ تەنك‌و خر بسەر لەشێ ماسیێ‌دا کو ب هزارا پێڤە هەنە دبێژنێ پیلەك .. وەك پارەی گروڤرە .

ـ بنکوهـ : خیاشیم

ـ حێبەتی : سەرسام

ـ نکلوك : چنگالا ماسیگرتنێ

ـ لب : دانە

ـ ڤالك : ڤالکا گوندوری یان زەبەشی ، کەرەکا ژ کیزی دهێتـە برین دبێژنێ ڤالك .. پارچەکا بچویك .

ـ خەرتاف ـ خەرتفاندن : مەبەست دارەکا کورتە (٥٠ ـ ٦٠ سم) ە نکلوکەك مەزن پێڤە گرێ ددن‌و ماسیا پێ دهلکێشن دەما ماسی کێژ دبت . یان بو ماسیگرتنا ئاڤە هەیڤاو ب چراکا .

تەرحە : مەبەست کەلەکە ژ دارا یان چوپا .. چوونکە بەرێ وەختێ سپیندار ب خابیری‌دا دهینان ل نێڤ گولی‌و سندی‌یا دکرنە کەلەکەکا پـەحن‌و پر دارو ئـەوێ کـەلەك دهـاژوت دگـوتنێ (تـەراح) یـان کەلەکڤان ..

فۆلکلۆر

# بەشێکی دیش لە

# گــۆرانیی فــۆلکلۆری کــوردی لە نـاوچـەی برادۆست دا

صدر الدین خۆشناو

خوێنەری هێژا بەشی ئەم جارە دەتێکستی فۆلکلۆرییە هی ناوچەی برادۆستە .. کە چی لە زۆر شوێنی دی بە پچڕ پچڕ هەندێکیانم بلاوکردونەتـەوە .. نیازی سـەرەکیم ئەوەیـە لەو کۆمەڵەی کە لە بەردەستمە وورده وورده بلاویان بکەمـەوە ، تاکو لە دەرفەتێکی دیدا لەبەرگێك بلاویان بکەمەوە ..

جا مادام کارەکە وای لێهات ئەو گـۆرانییانـەی کەوا بلاوم نەکروونەتەوە ، ئەوا وورده وورده بـلاویان دەکـەمەوە تاکوو چاویان بـەدنیای ڕوونـاکی بکەوێتو ، هیـوام ئەوەیـە ئێوەش تامو چێژێك لەم هۆنراوە فۆلکلۆرییانە وەرگرن ..

## جۆری شایی چوغ جانوو[1] ـ جەللەبۆ ـ

هات جەللەبۆ جەللەبە
یەك مالێ من جەللەبە
هەوشۆ مەچە لێرەبە
یەك مالێ من جەللەبە
مێوانێ زەریا خۆبە
یەك مالێ من جەللەبە
هات جەللەبێ بزنە
یەك مالێ من جەللەبە
من چەران تەڕازنە
یەك مالێ من جەللەبە
هات جەللەبێ بەرانە

یەك مالێ من جەللەبە
من چەران لە زۆزانە
هات مالێ من جەللەبە
بۆ خاترێ کچا جوانە
هات مالێ من جەللەبە
هات جەللەبێ بەرنیلە
یەك مالێ من جەللە بە
من ئاودا ل بنێ بیرە
یەك مالێ من جەللە بە
بۆ خاترێ کچێ میرە
یەك مالێ من جەللەبە

* * *

(۱) چـوغ جانـوو ! ئەمـەش جۆرە شـاییەکـە وەکوو شـایی شێخانییە بەلام ئەمە پێیەك لەبۆ پێشەوە دەچێو پێیەك بۆ دواوە دەگەڕێتەوە .

## - بەربەن - بزاندن -

هەی براندن بزاندن
یاریٰ بەربەن بزاندن

چوومە رەزیٰ بابیٰ تە
من دوو گول لیٰ پساندن

رووحان ل بەر دفن نیٰ
سمیٔل ل سەر قوچاندن

بەربەنیٰ یاریٔم جؤتن
سؤلکؤکە بزمار کؤتن
بەسەر هانیە دا دگؤتن

بەربەنیٰ یاریٰ سیٰ نە
هەرسیٔکان سؤل تەپیٔنە
هە ب سەرهەنیا داتیٔنە

بەربەنیٰ یاریٔم چارن
سؤلکؤکان بزمار خارن
هە ب سەر هەنیا دادبارن

بەربەنیٰ یاریٰ پیٔنجن
هەرپیٔنجان سؤلك ریٔنجن
هە ب سەر هانیا دادگەنجن

بەربەنیٰ یاریٔم شەشن
هەرشەشان سؤلك رەشن
هە ب سەر هانیا دادمەشن

* * *

## - نالبەندوٰ - شیٔخانی

نالبەندوٰ نالەو بادە
نالبەندوٰ نالەو بادە
دووکلی لە دەرگای دادە
نالبەندوٰ نالەو بادە
نالبەندوٰ نالٰ کچووکە
نالبەندوٰ نالەو بادە
شوونا نیوەکیٰ نەینووکە
نالبەندوٰ نالەو بادە
پارکچ بووی ئەو سالٰ بووکە
نالبەندوٰ نالەو بادە
نالبەندوٰ نالٰ مەزنە
نالبەندوٰ نالەو بادە
ستوونا نیوەکیٰ ئاسنە
نالبەندوٰ نالەو بادە
پارکچ بووی ئەوسالٰ ژنە
نالبەندوٰ نالەو بادە

* * *

## - کەو - سیٰپیٰیی

کەو بووینە جوٰت
کەو بووینە جوٰت
هیٰ کچە جوانیٰ
کەو بووینە جوٰت
کەو ل کیٔلیا
ویٰ د بووینە جوٰت
ل دەو دوٰلان
شین بوون کەووٰت
هیٰ کچە جوانیٰ
جەرگیٰ من سوٰت
کەو بووینە سیٰ
کەو بووینە سیٰ
کەو ل کیٔلیا
ویٰ د بووینە سیٰ
ل دەو دوٰلان
شین بوون راسیٰ
هیٰ کچە جوانیٰ
جەرگیٰ منیٰ
هیٰ کچە جوانیٰ
دلیٰ منیٰ
کەو بووینەچار
کەو بووینە چار
کەو ل کیٔلیا
ویٰ د بووینە چار
ل ناو باخچان
شین بوون هەنار
هیٰ کچە جوانیٰ
جەرگیٰ من خوار
هیٰ کچە جوانیٰ
دلیٰ من خوار

* * *

## - عەیشوٰکیٰ - شیٔخانی

عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
دیٰ بلا وەبی هەروەبی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
دەستیٰ من پەخلاتەبی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
دەبخیٔرا بابیٰ تەبی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
هە ل کەنگیو هاتە کەنگی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
مەمك سیٔوا فەرەنگی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
چ خرن ناچنە چەنگی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
مەمك سیٔوا سەرلکی
عەیشوٰکیٰ دەلالیٰ
دیٰ خراب کە ب نەینوٰکی

عەیشوکێ دەلالێ
مەمك لسێوێ ناو رەزا
عەیشوکێ دەلالێ
دێ خراپ کەن ل بە گازا

* * *

## ـ گولازەر ـ شێخانی

گولا زەر جان گۆزەل
وەز چوومە خانی فەرشا
گولازەر جان گۆزەل
من پرسیار کرد نەخۆشا
گولا زەر جان گۆزەل
بەکا زەریا ب لانەخشا
گولازەر جان گۆزەل
وەز چوومە خانی مانی
گولازەر جان گۆزەل
من پرسیار کرد ل مێوانی
گولازەر جان گۆزەل
بەکا زەریا ل بەنانی
گولازەر جان گۆزەل
تو شێروشکا نزاری
گولازەر جان گۆزەل
توکەنگی د گەل من یاری
گولازەر جان گۆزەل
ئەز چووم دەشتێ ئاگاکەم
گولازەر جان گۆزەل
نیسكو نۆکا لێ راکەم
گولازەر جان گۆزەل
ب شێروشکا مەقلوبی
گولازەر جان گۆزەل
تو کەنگی د گەل من شوبی

* * *

## ـ دۆتمام ـ سێپێیی

هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
تالێ ترشێ رەنگ شەمامێ
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
سۆلا د پێکا بچینا شامێ
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
هەروا دەروا لۆ حەمامێ

هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
کەوێ بەرتوم قوتنی شامێ
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
زارێ وەزۆ منێ مایۆ گایێ جوتی
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
ئەویش منێ بۆ فرۆتی
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
هەنکو دۆتمام لەگەل من گۆتی
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
منێ مایۆ تیا خەنجەرێ

هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
ئەویش دێ دم پشتا دارێ
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
هەنکو دۆتمام بێژی هارێ
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
منێ مایۆ ماینێ زینی
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
ئەویش دێ دەم ل مزگینی
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
هەنکو دۆتمام بسەلینی
هەی دۆت هەی دۆت هەی دۆتمامێ
منێ مایۆ خانی رەزی

هه ی دوت هه ی دوت هه ی دوتمامێ
ئه ویش دێ دم سه روکه زی
هه ی دوت هه ی دوت هه ی دوتمامێ
هه نکو دوتمام ببێ رازی
هه ی دوت هه ی دوت هه ی دوتمامێ
منێ مایۆ لوولیا تفه نگی
هه ی دوت هه ی دوت هه ی دوتمامێ
ئه ویش دێ دم ژارو ژه نگی
هه ی دوت هه ی دوت هه ی دوتمامێ
هه نکو دوتمام نه کا ده نگی
هه ی دوت هه ی دوت هه ی دوتمامێ

* * *

## - وه رنه سێوان - شێخانی

وه رنه سێوان وه رنه سێوان
وه رنه سێوان وه رنه سێوان
ئه ز سێوه ك بام سه رێ دارێ
کورکێن وه رنێ بینه خوارێ
من نه دانۆ ده ستێ یارێ
من ئه ده نه ده ست نۆ بووکا
دل من خراپ که به ر گوهارێ
وه ز سێوه ك بام سه رێ سوکا
کورکێن وه رنێ بیننه لکا
دل من خراپ که به ر نه ینۆکا
وه ز سێوه ك بام سه رێ ره زا
من نه ده نه ده ست ناحه زا
دل من خراپ که هه ر ل به رگه وزا

* * *

## - دوو شوانه م - دووپێیی (دمچه یی)

... انه م گۆ دوو شوانه
دوو شوانه م گۆ له به ر رۆژانه

تۆ ل کور مامه تۆ ل بوونه ، چوونه به ر رۆژێ
شه و نیوه کا شه وێ بوو ده ستم خاله بژ کۆره
دوو شه وانه م گۆ دووشه وانه لێ لێ به رهه وێزێ
تۆ ل کور مامه تۆ ل بوونه ، چونه هه وێزێ
دوو شه وانه م گۆ دوو شه وانه م
شه ونیوه کا شه وێبوو لۆلۆ ده ستم خالا نیرگزێ
دوو شه وانه م گۆ دووشه وانه لێ لێ دووشوانه ل شه وینێ
شه و نیوه کا شه وێبوو لۆلۆ په ز به ردابوو مێردینێ

* * *

## - هات کاروانه -

### شێخانی

هات کاروانه کاروانه بێ لم بۆ
هات کاروانه کاروانه زالم رۆ
هات کاروانه سه ربه خۆ بێ لم بۆ
دانه به ر ملکێ خۆ زالم رۆ
کچ ده فرۆشیت مه مکێ خۆ بێ لم بۆ
کور ده کری بۆ دلێ خۆ زالم رۆ
هات کاروانێ که ردارا بێ لم بۆ
دانابی ل بنێ دارا زالم رۆ
کچ ده فرۆشیت هه ناره بێ لم بۆ
کور ده کری بۆ ته داره زالم رۆ
هات کاروانێ هه رکی یه بێ لم بۆ
دانابی ل بنێ بی یه زالم رۆ
کچ ده فرۆشیت هه رمی یه بێ لم بۆ
کور ده کری بۆته وی یه زالم رۆ

* * *

### فه رهه نگۆك

ئه ز : من ، ئه من

بەردیل : پاش گەورەبوونی بەرخ دەبێتە کاوڕ ، ئینجا بۆ ساڵێکی دی دەبێتە بەردیل گەر مێ بیت .
بزاندن : پساندن
بەربەن : خەناوکە ، ملوانکە .

بەگازا : گەزەی لێ دەدا .
بژکۆرە : پشکۆی دار .
بوتەویە : بۆدەویە ، بۆ زارودەمە .

پەخلاتەبی : لە ناو باخەڵت بی ، لەسەر سینگ و مەمکت .
تەڕازنە : ئاژەڵ لەوەڕاندن لە مێرگ و نزار .
تەدارە : داخوازی ، داوا .
تۆل کوڕمامە : تۆی کوڕەمام .
جەللەبە : جەرەبی ئاژەڵ .
حەمام : گەرماو .
خارن : خواردی .
دفن : کەپوو ، لووت .
دادمەشن : دێتە خواری ، شۆردەبێتەوە .
دۆتمام : کچەمام ، ئامۆزا .
زەریا : کچ ، کیژ .
زۆزان : کوێستان .
دێ دم : دەیدەم .
ڕاسێ : جۆرەگیایەکە .
ژارێ : هەژار ، فەقیر .
سۆلکۆکە : بچوك کراوەی سۆلە کە مانای پێلاوە .
ستوونا : ئەستووندە .
سۆلا : پێتاو ، پێلاو .
فەرەنگی : بیانی ، بێگانە .
شەوین : شەو لەوەڕ .
قوتن : پەمۆ ، لۆکە .
کچووك : بچووك ، بچکۆلە .
کێلیا : کوێستان .
کەووت : جۆرە دارێکە کەلای بەقەد کەلای خۆخە .

کەوێ : کەوای ژنان .
گولازەر : گوڵی زەرد .
گوهارێ : گوارە .
مەچە : مەچوو .
مەزن : گەورە .
منێ مایۆ : من مایتمەوە .
مزگینی : مژدە .
مێردین : مێرگ .
ناڵبەندۆ : وەستای ناڵان .
نەینۆك : ئاوێنە ، هاوێنە .
وەز : من ، ئەز .
هانیا : هەنی ، نێو چاوان .
هەنکو : هەتا :
هەوێز : جێگای وەستانی مەڕو بزن .
هارێ : بەلێ .
هەوشەو : ئەوشەو .

## تێبینی

دانیشتوانی گوندی جەڕا بەشێوەیەکی زۆر چاك یارمەتیان دام بۆ کۆکردنەوەو تۆمارکردنی ئەم کارە فۆلکلۆرییە . بەلام ئەم برایانەی بەشێوەیەکی تایبەتی هۆنراوەکانیان لێ وەرگیراوە . لە زۆر شوێنی دی ناوم بردوونو باسی شوێنی لە دایك بوونو پلەی خوێندنو تەمەنیانم کردووە . بۆیە بە پێویستم نەزانی لێرە دووبارەی بکەمەوە . بۆیەش تەنها ناویان دەهێنم ئەویش ئەم برایانەن :

١ - عەزیز رەشید ئاودەل .
٢ - عبدالوهاب خدر خراوەیی .
٣ - شاکر برادۆستی .
٤ - یوسف شریف .

ص . خ

# گەشتێك بە نێو
# کەلەپووری کوردیماندا ..




ئێمەی دانیشتوانی شاری هەولێر زۆر بـاش ئەوەمـان وەبیر دێتەوە کـە چەنـد ساڵێـك لەمەوبـەر چەنـد شەربـەت فـرۆشێکی گەڕۆك هـەبـوون کـە بـە سـەرڕێـوە دەگـەڕانو شەربەتیان دەفرۆشت ، ئەوانە بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا شەربەتی مێووژە ڕەشی سادەی بـە بەفـری سرووشتیـان دەگێرا بۆ فرۆشتن .. ئەو کاتەی من دەمـەوێ باسی بکـەم ، ئامێری میکانیکیو کارەبایی نەبوو بۆ دروست کردنی شەربەتو هەڵپشاوتنی مێوەجات ، بۆیە بە ناچاریەوە مێووژی ڕەشیان دەخووساندو ئەمجا دەیان ئاخنیە نێو جاغێك کە لە « بوزی » - واتە قوماشی ڕانکوچۆغە - دروستکرابوو ، ئیتر بە دەستو پێ دەیان شیلا تا هەموو ئاوەکەیان لە تلپەکە جۆرەبڕ دەکرد جا پاش جیاواز کردنەوەی شیلاوی مێوژەکە لە تلپەکەی ئەوسا بە قەدەر شیلاوی مێوژەکە یانەختێـك زیاتـر ئاویـان تێدەکردو دەبـوو بە شـەربەت . ئێستـاش چەنـد بنەمـاڵەیـەك هـەن منداڵەکانیان بەڵکو ئافرەتەکانیانیش تاکو ئێستا هەر مـاوونو زۆر باش ئەو مەسەلەی شەربەت کردنەیان وەبیر دێتـەوە کە چـەند پێـیەوە ماندوو دەبوونو زەحمـەتیان دەچێشت بـۆ ئـامادەکـردنی شێلاوی مێـوژ بۆ شـەربەت .. جـۆرو بـاشی شەربەتـەکەیش بـۆ هێندێ لەو بنـەماڵانـەی کە مـەبەستی باسەکەمە بۆیان بووە بە نازناوو پێوەی ناسراون ، ئەو بنەماڵانە تەنانەت لە کاتی پشووداندا ، خەوتنیشا حەسانەوەیان نەبوو لە بەر ئامادەکردنی شیلاوی ناوبراو بە جۆرێ کە ماڵەکانیان دەبووە ، نەزرگای مێشو مەگـەزو زەرگەتـەو زەنگەسـوورەو هەنگ ، ئەمە لە لایەكو لە لایەکی دیکەش تلپە تاڵەکەش لەبەر مانەوەو گەرمی دەپیشاو ترشایی سەری مرۆڤی کاس دەکرد « هێردەکرد » لەگەڵ ئەو هەموو ماندووبوونەشدا ، زۆر بـە خۆشیو چووستی ، ڕۆژێ لە کـارەکەیـان دوا نەدەکـەوتن ، چوونکە بە زۆری ژیانیـان لەسەر فـرۆشتنی ئەو شـەربەتـە دابیندەکرد .

## ● ئەو کەلو پەلانەی شەربەتیان تێدەکرا ●

شەربەت فرۆشەکان بۆ فرۆشتنی شەربەت جەڕەیەکی سەوزی قوڵپ داریان دەهێناو لولەیـەکی قامیشیـان لێ قایم دەکرد بە هۆی قیرو زفت .. ئینجا قایشێکی نەختێك پانیان لەو قوڵپ بۆ ئەویتر شەتەك دەدا خـۆ ئەگـەر جەرەکـە نەختێـك گەورەبوایە ئەوا دەبوایە لە ژێرەوەش غەمێکی بۆ بخۆن تا بە

هاسانی بۆیان هەڵگیرو وەرگێر بکرایەو بێ ترس گۆزەکەیان تێدا بسووراندایە تاوەکو بە هاسانی کاسەیان بۆ کریار پڕ شەربەت بکردایە ، بەلام ئەمکارە بەرەبەرە هەندێ گۆڕانی بەسەردا هات وەکو گۆڕینی گۆزە بە شووشە ، کە تا ئەم سالانەی دوایش هەر بەکار دەهات .

لە ڕاستیدا کاری شەربەت فرۆشتن وەنەبێ هەروا شتێکی هاسان و بێ ئازاربووبێ ، نەخێر ! شەربەت فرۆشی بێچارە دەبوایە بە گورجی ئەم سەرو ئەوسەری شار بکات و بێت و بچێت ، بۆ ئەوەی بتوانێت چەند گۆزەیەکی شەربەت بفرۆشێ و بەفرێکی کەمیش سەرف بکات ، چونکە چەند فرۆشتنی شەربەتەکەی دوابکەوتایە ، هێندە بەفری زیاتر بەکار دەهێناو بە فرەکەیش ئەوسا بە هاسانی وەدەست نەدەکەوت چونکە لەو ڕۆژگارەدا « کارگەی بەفری دەستکرد » لە شاری هەولێردا نەبوو ، بۆیە ئەو بەفرەی لە وەرزی زستاندا لە بەرزترین شوێنە نیسارەکانی چیاکانی کوردستاندا لە چاڵ دەکرا ، لە وەرزی هاویندا دەهێنرایە شارو بۆ زۆر پێویستی بەکار دەهات ، کە شەربەت یەکێك بوو لەو پێویستییانە .

**● بەفر لە چاڵکردن ●**

کەم دەرامەتی و خراپی باری دارایی هەندێ لەو خێزانانەی کە لە ناوچە شاخاوییەکان و دەوروبەری دا دەژیان وای فەرز کردبووە سەریان کە لە ڕۆژانی هەرە ساردی زستان و لە گەڵ کرێوەو زریانی بەفردا بچن بەفر لە چاڵ بکەن و ئامادەی بکەن بۆ وەرزی هاوین لەو ناوچانەدا کەسانێکی واهەبوون لە بەفر داکردندا پسپۆرییان پەیدا کردبوو .

ئەو بەفرە لە چاڵەکە دەکرا دەبوایە باش بپەستێرێتە پاڵ یەك « سەریەك » ، تا دەبوو بە تەختە بەفر بۆ ئەوەی هەوا « با » کاری تێ نەکاو نەی توێنێتەوە ، سەرەڕای ئەو پەستنەیش دەبوایە خۆی و کایەکی باشیش ، بخەنە سەری تاوەکو نەتوێتەوە ، ئیتر لە وەرزی هاویندا کە بەفر پێویست دەبوو ، بەفرەکە پارچە پارچە دەبڕاو دەکرا بە بارو بە وولاغ دەگوێزرایەوە بۆ شارو ئەو ناوچانەی کە بەفری لێ دەفرۆشرا ، بەلام گەر بۆ شارەکانیان ببردایە ئەوە بەفرەکەیان دەخستە نێو جەواڵی پڕ لە کا تاوەکو گەرما کاری تێ نەکاو نەتووێتەوە ، ئەو بەفرەیش کە بەم جۆرە دەگوێزرایەوە بۆ زۆر مەبەست بەکار دەهێنرا ، وەنەبێ هەر تەنها بۆ شەربەت بووبێت وبەس .

**● شەربەت فرۆشتن ●**

باشم وەبیر دێتەوە ، مندال بووم ڕۆژێ لە ڕۆژانی هاوین و لە شاری هەولێر چاوم بە شەربەت فرۆشێك کەوت ، کە تا ئەم سالانەی دواییش هەر مابوو لێی نزیك کەوتمەوە داوای تاسە شەربەتێکم کرد ، مامەی شەربەت فرۆش گورج نەختێ چەمایەوەو تاسەکانی لە یەکتری داو بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی : « جەلاب » منیش بە سەرسامییەکەوە وام زانی لە گەڵ منیەتی گورج وەلامم دایەوەو گوتم : مامە من « جەلاب » نیم ، من ناوم .. بە زەردەخەنەیەکەوە ! گوتی : کوڕم ئەوەی دەیخوێتەوە « جەلابە ، کەلە تەزێنە ، عیلەت پەڕێنە » بە تاسەیەك تامی زارت خۆش بکەو هەناوت فێنك بکەوە ، ئەوسا تاسە قەراغ گڕن گڕنەکەی بۆم پڕ شەربەت کرد ، شەربەتەکە لە بەر ساردی و بە رزو نزمکردنی گۆزەکە شەربەتی نێو کاسەکە کەفی هەڵدابوو بە سەر تاسەکەوە پۆقژەی هەڵدابوو ، مامەی شەربەت فرۆش لە بەر ئەوەی هێندە بە سەر ڕێیەوە گەڕابووو ئەم کۆلان و ئەو کۆلانی نێو بازاری کردبوو ، ئەژنۆکانی کەوتبوونە لەرزین و ئارەقەی نێو چەوان ملیشی وەکو کاروانی مێروولە ڕێچکەیان بە ستبوو زەنگوڵ زەنگوڵ بەردەبوونەوەو پشتیشی یەك پارچە بووبوو بە ئاو ، لە گەڵ ئەوەشدا وەك بزمار لە جێگای خۆی چەقیبوو ، وای نیشان دەدا کە ماندوو نەبووە ، ئیتر دوای ئەوە تاسە شەربەتەکەم تا دوا تنوك هەڵمژی ، مامەی شەربەت فرۆش تاسەکەی وەرگرتەوەو خستیە نێو ئەوسەتڵەی کە بۆ شووشتنی تاسەکان ئاوی تێکردبوو .. دووبارە کەوتەوە گەڕان و ڕووی کردە ئەو شەقامەی بەرەو قەلا دەڕۆیشت بەرەو دوکانەکانی خوالێخۆشبوو « ئەحمەدەفەندی » کە ئێستا بناغەیشیان نەماوە .. ئەو شەقامەش یەکەمین شەقامی قیرتاوکراوی شاری هەولێربوو ، سەرنجم دایە بینیم زۆر چالاکانە بەو هەورازەدا هەڵ دەگەڕاو وورده وورده بۆ دیوی مزگەوتەکەی حاجی قادرو ئاشی خوالێخۆشبوو « ئەحمەد

چەڵەبی » غلۆر دەبووەوە ، قەستی ئەوەی دەکرد ڕوو بکاتە مەیدانی گەنم فرۆشانو دانیشتوانی دەوروبەری « خانی سپی » و کۆڵانی لباد کەران ، کارگە چیان ، کە ئەم شوێنانە ئێستا نەماونو بوون بە بازاڕی گۆشت فرۆشو چەندەها دوکانی دیکەو گوڕەپانی وەستانی ئۆتۆمبێل .. ئیتر دوای گەڕانو سووڕانیکی زۆر لە نێو کۆڵانەکانی کارگەچیو دوکاندارانی ناوچەکە ڕووی دەکردە هەڕاج خانە « قاڕی بازار » و بەنێو قەیسەری پێڵاو فرۆشاندا ، ئەو دەمی لەو هەڕاج خانەیەدا ژنو پیاو وەکو کلۆ « کوللە » هاتوو چۆیان دەکرد لەبەر نەبوونی کۆگاو شوێنی دیکە ، بەم جۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم گەڕانو سووڕانەی دووبارە دەکردەوە بۆ ئەوەی زیاتر بفرۆشێو ڕێگەی شەربەت فرۆشەکانی دی نەدات تاوەکو جێگەی بگرنەوە ـ ئەو کاتە لە شاری هەولێردا شەربەت فرۆشەکان ژمارەیان لە ژمارەی پەنجەی دەست ڕەتی نەدەکرد ، لەگەڵ ئەوەشدا مامەی شەربەت فرۆش ململانێی لەگەڵ کۆمەڵی کڕیکارو فرۆشیاری بازار دەکردو خۆی دەکوتایە نێو کۆمەڵی خەلکیو بە هەموو دەنگی هاواری دەکردو. دەیگوت : « شەربەتە » .. بێ غیللەتە ، کەللە تەزێنەو عیللەت پەڕێنە » ، ئەڵبەتە دانیشتوانی شاری هەولێر ئەو شەربەت فرۆشەیان زۆر خۆش دەویست ، پیاوێکی پاكو خاوێنو ڕاستگۆو ئایین پەروەرو ڕوو بە پێکەنینبوو ، لە زۆر پیاوی ماقوڵم گوێ لێبووە ، کە مامەی شەربەت فرۆش ساڵێ زیاتر لە نۆ مانگ بە سەرماو سۆڵەی زستانو گەرمای هاوێن بە ڕۆژوو دەبوو ، ئەو شەربەتەی دەشی فرۆشت تابلێی بێ فروفێلبوو ، بە لای ئەو ڕەنگو دەرمانانەوە نەدەچوو کە ئێستا پەنای وەبەردا دەبەن ، هەر بۆیە زوربەی دوکاندارو کاسبکارانو دانیشتوانی شار تاوەکو شەربەتی ئەو هەبوایە هی شەربەت فرۆشەکانی تریان نە دەخواردەوە ، گەلێ جاری وادەبوو مامەی شەربەت فرۆش کە ناوی « مام حەمە شەریف » بوو ، کوڕو نەوەکانی تائێستا لە شاری هەولێردا ماون ، بە کارێکی سەیری مەزانن کە دەڵێم ، ئەو کەسانەی فێری خواردنەوەی شەربەتی مام حمە شەریف بووبوون ، بەو پەڕی تاسەو ئارەزووەوە چاوەڕوانی خواردنەوەی شەربەتی ئەویان دەکرد با لە کاتی



خۆشیا وەدەر نەکەوتایە ، بەلام ئەم وەفاداری‌یە زۆری نەخایاند دوای ئەوەی کۆمەڵێکی زۆر دوکانی تازەی شەربەت فرۆشتن بە نێو شاردا بلاوبوونەوە ، ئیتر بازاڕی مام حەمە شەریف ڕووی لە کزی کردوو ، خۆیشی وەکو جاران ئارەزووی لەسەر کارەکە نەماو لێی بێزاربوو ، چونکە بە نێو سالاندا کەوتو پیربووو ئەو توانایەی جارانی نەماو ئەو گورج و گوڵی و چوست و چالاکی‌یەی لە تەمەنی جاحێڵی‌دا هەی‌بوو بەرە بەرە ڕووی لە کزی کردو لە دوا ڕۆژانی تەمەنیدا پشتی‌لەو کارە کرد کە هەر لە منداڵی‌یەوە لە گەڵیدا ئاشنا بووبووو چێژو تامێکی تایبەتی لێ وەردەگرت ..

ئەو مرۆڤە گورج و گوڵە ـ واتە مام حەمە شریف ـ م دوای بیست ساڵ یا زیاتر بینیەوە ، تەواو پیرببوو ، ڕیشی سپی هەڵگەرابوو ، تەنانەت برۆو برژانگەکانیشی سپی‌ببوون ، بەلام هەر وازی لە شەربەت فرۆشتن نەهێنابوو ، ئەمە جگە لەوەی کە هەروەك جاران پاك و خاوێن‌بووو گۆسکەو تاسەکانی شەربەتیشی هەر وەکو جاران بە پاك و خاوێنی ڕاگرتبوو ، بەلام ئەوەی کە وەکو جاران نەمابوو دەنگە بەسۆزەکەی بوو ، چونکە پیری کاری تێکردبوو ئیتر بە دەنگێکی نزم و لە شوێنێکدا دەوەستاو هێمنانە شەربەتەکەی دەفرۆشت و دەی گوت :
« کوڕینە ، هەر شەربەتی جارانە ، دۆشاوی مێوژە ڕاوەستە کاسەیەکی هەڵژە» ئەوجا ئەوانەی مام حەمە شەریفیان خۆش دەویست دەچوونە لای و شەربەتیان لێ‌ی دەکڕی . منیش لە مامە حەمە شەریف نزیك بوومەوەو دیتم بووە بە حاجی ، هەرچەندە وەبەر گوێشم کەوتبوو کە دەیان گوت گەلێ حەجی کردووە ، پێم گوت مامە حاجی دەبینم بازارت کزە ، « پیری و هەزار عەیب » بەلام مامە حاجی گورج وەرامی دامەوەو گوتی : « سەید ، وامەزانەو واشم تێ مەگە ، هەزار دەرزی گاسنێکی تێ‌نابێ » . لەو وەلامەی بۆم ڕوون بووەوە کە ئەو مرۆڤە چەند لە خۆی بایی بووەو چەند باوەری بە هێز بووە ، بۆیە بەو تەمەنەش بەربەرەکانی زەمانەی کردووە بۆ زامن‌کردنی پێویستیەکانی ژیانی ،

ئەوەی ڕاستی‌بێت ئەم وورە بەرزی‌و نەفس پاکی‌یەی ئەو مرۆڤە هانی دام ئەم چەند دێرە لە بارەی شەربەت و حاجی حەمە شەریفی شەربەت فرۆش بنووسمەوە ، بۆ ئەوەی کۆمەڵێکی زۆری خوێندەوارانی شاری هەولێر بزانن ڕۆژانی ڕابردووی ئەم شارە دێرینە چۆن بووەو دانیشتوانیشی چۆن ڕۆژگاریان بردۆتە سەرو بەردەوام سوودیان لە بەرهەمی سرووشت وەرگرتووەو تاوەکو ئیمڕۆش هەر لە ئەنجامی ئەرك و کاری ئەواندا بە هاسانی وەگیر ئێمەیش دەکەوێ ، بەلام ئێستا بە شێوەیەکی جیاواز لەگەڵ جاران ، ئەمڕۆ بەهۆی ئامێرو کەرەستەی تازە بابەت . خو ئەگەر نەختێك لە حاڵ و گوزەرانی ئەوسای شەربەت فرۆشان وورد بینەوەو وێنەی مام حاجی حەمەشەریف بێنینەوە بەرچاومان، ئەوە زۆر چاك بۆمان وەدەر دەکەوێ کە باری ژیان چۆن بووەو چۆنیان ڕۆژگار بەسەر بردووە ، ئەو ڕۆژانەی « سەلاجەو موجەمیدە » نەبووەو بەفری بە ئامێر دروست‌کراویش « بوز » کە لە هەولێر باوە ، واتە « سەهۆڵ » لەو دواییەدا پەیدا بووە ، ئەوسا کە سەهۆڵ نەبووە ، دانیشتوانی شار بە هەژارو سەرمایەدارەوە ئاوی ساردو ساردەمەنیان بە بەفری سرووشتی دابین دەکرد ، بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا بە « تا » واتە بە « بار » باریش لە سێ « تا » پێك دەهات ، یا بە کووز ، ئەو بەفرەیان لە بەفر فرۆش دەکڕی ، وەکو لە پێشەوە گوتمان لە شاری هەولێردا چەند شەربەت فرۆشێك هەبوون ، هەروەها لە تەك ئەوانیشەوە چەند بەفر فرۆشێکیش هەبوون ، ئەوانە مامڵەتیان دەگەڵ چەند لادێ نشینێکی بناری کێوی سەفین دەکرد دەربارەی بەفر ، بە زۆریش ئەو بەفرە لە سەر چیای سەفین « گۆڕی ـ مێرگی ـ خانزاد » لە چاڵ دەکرا ، چونکە سەفین لە شاری هەولێرەوە نزیك‌بوو ، بەلام وەنەبێ لە شوێنەکانی دیکە چاڵ نەبووبێت ، بەڵکو لە زۆر شوێنی تری دەوروبەری شارو ناوچەکانی تری کوردستان بەفر لە چاڵ دەکرا بۆ هەموو ئەو مەبەستانەی لە سەرەوە پەنجەم بۆیان ڕاکێشا ، ئیتر هیوادارم توانیبێتم شتی بۆ ئەو کەسانە ڕوون بکەمەوە کە مەبەستیانە بزانن ئەم لایەنەی ژیان لە هەولێردا چۆن بووەو چ کاریکی کردۆتە سەر باری دارایی و گوزەرانی خەڵکی ئەم شارە .

# سترانا.. حەمێ موسێ

**ئامادەكار :**

**نورالدین انور بۆتانی**

**١٩٨٥/٥/١٨**

بڕاستی گەلەك دەنگ بێژێن ب بها ل جزیرا بـۆتاندا ڕابوونە و ئەز دكارم بێژم كو هنـەك ژوانا هـاتنە نـاسكرن و ناڤدارن ل تەڤایا دەڤەرێن كـوردستانێ ، ئـەو ژی ژبەر كـو دئێزگەهـوهەمپارێن دەرەكەدا یێن تۆماركرنا سترانا (الشركات الأجنبية لتسجيل الاغاني) ستران گۆتنە ، ژوانـا وەك محمد عارفێ جزیری وحسنێ جزیری وسعید آغا وگەلەك دن ژی .
لێ ناسكرنو ناڤداریێا هنەك دەنگ بێژێن دن ل دەڤەرەك بۆ دەڤەرەكا دی دمینە ، وەك دەنگ بێژێ كو مـە ئەڤ سـترانا (حەمێ موسێ) ژزارێ وی نڤیساندیێە .
(*) دەنگ بێژێ مە ، ناڤێ وی محمدە كوڕێ مـەلا عەرەبێ بۆتیێە ، ب ناس ناڤێ مەحمە مەلایێ بۆتی ناڤدارە ، خاسمە ل دەڤەرا بەردەڕەش (عشائر السبعة) سەر ب قەزا ئاكرێ .
ناڤ بری ل دۆربـەرێ سالێن (١٩١٨ ـ ١٩٢٠ ز) ژگـوندێ شێخالك سەر ب ناحیا بەردەڕەش چاڤێن خوە ژبـۆ دنیایـەكا ڕۆهن ڤەكریێە ، پشتی چەند سالا ل ور مشـەخت د بەو ل گوندێ قایماوا ئاكنجی د بە ، لێ بەری دنیا ڕۆهن لێ تاری بە جارەكا دی مشەخت د بەو ڤێجارێ ل گوندێ ئیسماوا ئاكنجی دبە ئول دۆربەرێ سالێن (١٩٦٤ ـ ١٩٦٦ ز) تالیێا ژیانا خوە ل ور ب داوی تینە . بابێ وی مـەلا عەرەبێ بـۆتی ژ خەلكێ جزیرا بۆتایە ئو ئەو ژی ب خوە دەنـگ بێژ بـوویە ول سـالێن (١٨٤٨ ـ ١٩١٠ ز) دگەل دەها مالێن بۆتانیادا مشەخت دبنو ل دەڤەرا بەردەڕەش سەر ب قەزا ئاكرێ ئاكنجی دبن .

### ستران[*][*]

ئای ڕۆی ڕۆی ڕۆی ڕۆووو ..
ئەرێ حەمۆ لێ لاوۆ ، سوبەیە فەجرێ بـەیانـە ، مەجـەلێ[1] قاوانو مەسینا .
حەمۆ لێ لاوۆ ، سوبەیە فەجـرێ بەیـانە ، مـەحەلێ قـاوانو مەسینا .

حەمێ ب سێ دەنگا دکر گازی ،
سمو خەتابۆ تونێ لەزکە و ب لەزینە ،
حودێ کورێ خوە ب قیرینە ،
-رێ دووربینێ ژ تەرا بینە ،
عەینا چەپێ ب نوقینە ،
عەینا ڕاستێ ل سەر مادەنا دووربینێ ب گەرینە ، نیشانێ سێ سەلەف سوارێ وەسمان پاشا ل تیرا بنێ بەڕێ یێ ژبۆ برازایێ خوەرا پێ هەلبینە رۆی روو ..

* * *

ممێ خەتاب ڕابوو لەزکرولەزاندی یە ،
حودێ کورێ خوە قیراندی یە ،
-ارێ دووربینێ ژێرا ئانی یە ،
عەینا چەپێ نوقاندی یە ،
عەینا ڕاستێ ل سەر مادەنا دووربینێ گەڕاندی یە ،
نیشانێ سێ سەلەف سوارێ وەسمان پاشا ل تیرا بنێ بەڕێ یێ ژ بۆ برازایێ خوەرا پێ هەلتینە رۆی روو ..

* * *

شادە شودێ حەمێ گەلەك هەبوو ، ب سێ دەنگا دکر گازی هۆ هۆ مامۆ خەتابۆ ،
دەتو نیشانی سەلەڤ پێشێ بۆ من بێژە ب چ نیشانە
دگۆ مامۆ ئەزێ هەندی مادەنا دووربینێ ،
ل وان عەگیدو کول مالا دگەڕینم ،
سەلەڤ پێشێ تێن مەهینێ وان تێکرا بۆزن بەیازن دەگ دەگینە ،
رکێبێ وان حەوێزینە ، زینێ وانی زەرن تەوریزینە ،
عەگیدێ ل سەر پشتێ وان مەهینا مامۆ ب چ نیشانن ،
دگۆ جەڕابێ(٢) ل پێ یێ وانی ئەنگلیزینە ،
بەر سینگێ وانی ب کەسمەکی(٣) زەری داخستینە ،
کومێ(٤) ل سەرێ وان فێسی مەغرەبینە ،
تفنگێ دەستێ وانی قەپاغینە(٥) ، سمبێلێ وانی سۆری ئەتەرینە ،
چاڤ ل سەردا لێ سۆر بینە ،
ب کراس و دەرپی یەکا مەگرومینە ،
خەیۆ تێکرا تو دبێژی مرۆڤێن داوەتلینە رۆی روو ..

* * *

ئەوێ ڕۆژێ شادە شودێ حەمێ گەلەك هەبوو ،
بسێ دەنگا دکر گازی مامۆ خەتابۆ ،
ب ناڤێ خوەدێ کەمە ژ من ڕا نەبێژە ئەو قەت تو نینە ،
ئەو هەموو ڕۆمیکن ، ڕۆمیکێ ئەسلینە ،
شارێ موسلینە ، کەرکوکلینە ، بەغداینە ،
مێردینینە ،
ئەون کو ل قەهوەخانا ڕوونشتینە ،
ناڤێ ساری جەمدی ڤەخوارینە ،
ب قەلوونێ تەر کشاندینە ،
خوە ب سابوونا حەمام لش دکرینە ،
گۆشت مریشك و پەلاو برنجێ خەلکێ دخوارینە ،
هەسپێ خوە ب جەهێ فەقیرو هەژاران قەلەو کرینە ،
چ جارا شەق و شوقێ دارێ ڕما ل نێڤا مەیدانێ نەدیتینە ،
سەد جارا ب ناڤێ خوەدێ کەمە ئەون ئەوێ ڕۆژێ دگۆ ، قال و قول جەنگی گران ،
خرینی گاور بەردانا ،
تەرەقینی دارێ دار ڕمان ،
برقە برقێ کۆسە مسریان(٦) ،
وێلە وێلی عەیشان و عەوێشیان(٧) ،
شەقینێ سول و بزمارێ دەوێری یان(٨) ،
ڤرە ڤرێ چەڤی یەو عەگالان ،
بوردە بوردێ دەسمالیان ،
ئەزێ ئەوێ ڕۆژێ نووکا(٩) ڕمێ ل کورێ گدی بابەکێ بکم ب خوینە ،
ئەوێدی تەڤدا دبێژن قاشتی قاشتی قەغوایە ،
چمە لازم نینە ،
تەرەقینی وێران ب کەڤی ب چۆلێ ژ بۆ خوەرا درەڤینە رۆی

رۆوو ..

* * *

والله هەی دەبەردێ حەمو حەیرانۆ ،
میری میرانۆ ، رەشاشێ ل عەردانۆ ،
بالێ تەیرانۆ ، سنجاقێ[10] ل سەر مەمکێ کە چکانۆ ،
کلێ چاڤێ کەچکێ زیلانۆ حەیدەرانۆ ،
ئەڤجە رۆژێ سێ جارا سەرێ تورکێ و نورێ و کەکێ فەیۆب بی
ب قوربانۆوو ..

* * *

ئای رۆی رۆی رۆ وو ...
دکۆ مامۆ خەتابۆ دەتو نیشانێ سەلەڤێ ناڤێ بۆ من بێژە ب چ
نیشانە ،
دکۆ مامۆ ، ئەزێ هەندی مادەنا دووربینێ ،
ل وان عەگیدو کول مالا دەگەرینم ،
سەلەڤێ ناڤێ تێن مەهینێ وان تێکرا بوزن بەیازن دەگ دەگینە ،
رکێبێ وان حەوێزینە ،
زینێ وانی زەرن تەوریزینە ،
عەگیدێ ل سەر پشتێ وان مەهینا مامۆ ب چ نیشانن ،
دکۆ جەرابێ ل پێ‌یێ وانی ئەنگلیزینە ،
بەر سینگێ وانی ب کەسمەکی زەری داخستینە ،
کومێ ل سەرێ وان فیسی مەغرەبینە ،
تفنگێ دەستێ وانی قەپاغینە ،
سمبێلێ وانی سۆری تەتەرینە ،
چاڤ ل سەردا لێ سۆر بینە ،
ب کراس و دەرپی‌یەکا مەگرومینە ،
خەیۆ تێکرا تو دبێژی مرۆڤێن داوەتلینە رۆی رۆ وو ..

* * *

شادە شودێ حەمێ گەلەك هەبوو ، ب سێ دەنگا دکر گازی دکۆ
مامۆ خەتابۆ ،
ب ناڤێ خوەدێ کەمە ، ئەون عەسکەرن عەسکەرێ پەیادەرن،
تەمام قوەتێ دینێ نەبی محمدن ،
مللەتەکی گەلەك زۆر شەر کەرن ،
گەلەك چیایێ مەزنن ،
بەحرێ کویرێ سەر دنێ‌نە ،
هەموو عەزیزێ بەر دلێ دی‌بینە ،
زێدە بارێ بابێ‌نە ،
کورێ دخەلکێنە ،
ب خورجێ گۆشت و شیرو ئارینە ،
بەلێ وەرە میرۆ لێ پەیابە تو جارا ل نێڤا مەیدانێ بەرگێرێ
مەعنەگان و دەل و نژدیان نەکرینە رۆی رۆ وو ..

* * *

ئای رۆی رۆی رۆ وو ...
دکۆ مامۆ خەتابۆ دەتو نیشانێ سەلەڤێ پاشێ بۆ من بێژە ب چ
نیشانە ،
دکۆ مامۆ ، ئەزێ هەندی مادەنا دووربینێ ل وان عەگیدو کول
مالا دگەرینم ،
سەلەڤێ پاشێ تێن مەهینێ وان تێکرا قۆرکن مسینە ،
کمێتن قاپ رەشن دامان تاری‌نە ،
دێل و بژی شینی کەفەل مامزی‌نە ،
عەگیدێ ل سەر پشتێ وان مەهینا مامۆ ب چ نیشانن ،
دکۆ جلێ ئەوان سەبابان تێکرا قرێژی کرتینە ،
عەگێلی سەرێ وانی بەکێ‌تینە ،
باب چوخێ شیرێ وان ب سەلەسرینێ پێچاینە ،
قەلوونێ وان بوستەکێ لقرێژێ دارزینە ،
ل ڤرحەتا دارێ موسەیان چ مالی ئاگر ب وان عەگیدو کول مالا
قەت تونینە رۆی رۆ وو ..

* * *

ئەوێ رۆژێ شادە شودێ حەمێ گەلەك هەبوو ،
ب سێ دەنگا دکر گازی هۆ هۆ مامۆ خەتابۆ ،
ب ناڤێ خوەدێ کەمە ، ب وێ گال گالێ تو دبێژی بەر سینگێ
دلێ برازایێ تە ل وان سەی بابان ب قەتینە ،
ئەو هەموو پشکێ ژەحرێنە ،

نو کولکێ مەوتێنە ،
ڕەوحانێ ڕۆژو شەڤێنە ،
مال باب‌تێ ل مالێنە ،
عەگیدێ ل جەردێنە ،
ب ناڤێ خوەدێ کەمە ، چی دەمێ تو ناڤێ ئـەوان کول مـالا تینی ، ل خەیالێ من وەرایە ، ب عەمرێ بابێ خوەڕا دارێ ڕمێم ب دەستێ خوەڕا نەگرتینە رۆی رۆ وو ...

* * *

ئەوێ ڕۆژێ شادە شودێ تورکێ گەلەك هەبوو ،
چی دەمێ ل بن کۆنا دەردکەت ،
ب دانگی بەری مالا دکەت ،
ب سێ دەنگا دکر گازی ، هۆ هۆ حەمۆ لێ لاوۆ ،
ئەرێ براوۆ ،
زراڤێ تە ڕژیاوۆ ،
زراڤێ تە نەزراڤی مێرانۆ ،
جەگەرێ تە نەجەگەری شێرانۆ ،
زەندەقێ تە ل چار سوارێ وەسمان پاشا مەقەتیانەوۆ ،
ئیرۆ کۆنێ حەمۆ بەردایی ل دانگی بەری کۆنا ،
ل چەمێ وەڕانێ ،
ل حەوێزا محمد علي پاشا ،
ل تیرا بەرازی بنی‌بەڕی‌یێ ،
د ژێردا کۆلەك‌و عودە[11] ،
ل بەردا کانی‌و بەرە ،
ل‌بن‌دا قەلاتی نەمروودە ،
شادە شودێ حەمێ موسێ سواری مەهینا دولدری[12] ، چاڤ سۆری ، گەردەن گازی ، بیست وچار بـزماری ، مـەحبوبێ دەلالێ دلێ من گەلەك هەبوو ،
دەنگۆ وەرن مێزە بگرن کو مەهینا حەمێ من ب چ نیشانە ،
ئەوی دێل وبژی شینی کەفەل مامزینە ،
دی‌یا مەهینێ مەعنەوی‌یە ،
بابێ مەهینێ دەل‌و نژی‌یە
ب ناڤێ خوەدێ کەمە ئەوێ ڕۆژێ تورکێ دگۆ ،

ئەگەر ئیرۆکە ترسێ من حەمێ موسێ‌و کەلحێ برا نەبێ ،
ئەز ب خوە ڕابم سوار بم ل مەهینەکا کمێتی قاپ ڕەشی دامان تاری ،
دێل بەردی دێل بەردایی ،
ئەوێ ئەسلی ب عەمرێ کیتابێ برنجی‌دا ژهەموو دەوێرا ،
بەلێ والله ئەز چ بکم ئەوێ ڕۆژێ خەلك‌و عالەمێ دنیایێ هەموو دبێژن ،

هەوارەکا خوەدێ ئیرۆکە مێر ل نـاڤ کۆچـەرێ بەرازی‌یـان نەمانە ،
لەومانە ژن تێن داکەونە مەیدانێ ،
ئەز ئەوێ ڕۆژێ ژ بۆ برایێ خوەڕا بمە خێلنـەك ژوان خێلنێ مەکعودە[13] رۆی رۆوو ...

** **

### فەرۆزو پەیڤێن گران

*) تشتێ لسەر ژیانا دەنگ بێژی هاتی‌یە ، هێژا سید سمایل ژمن‌ڕا گـۆتی‌یە ، ئـەو بخوە ژی دەنـگ بێژە ، ژخـەلکێ گونـدێ (مەم بۆتان) ە لدەڤەرا بەردەڕەش ، نها ئەو گوند کـاڤل بـوویە ،، ئـو لبازارێ هەولێر ئاکنجی‌یە .

(*) (*) مە ئەڤ سترانە دکاسێتەکێ‌دا ڤلیساندی‌یە ، ئو ئەو کاسێت لجەم من هەیە .

١) مەحەل = دەم ، وەخت ، کات .
٢) جەڕاب = پێلاڤ ، پێتلو
٣) کەسمەکی زەر = زەخمەکی زەر ، یەلەکەکی زەر .
٤) کوم = کولاڤ ، ئەڤچینەیە .
٥) قەپاغی = نڤشەك تڤنگێ کەڤنارەیە .
٦) کۆسە مسری = ئەو ژی نڤشەك تڤنگێ کەڤنارمیە .
٧) عەیشان وعەوێشی = ژمەهینا بەزا وژێهاتی‌ڕا دبێژن عـەیشان وعەوێشی .
٨) دەوێری‌یان = دەواران ، ژمەهین وهـەسپ و هێسترڕا دبێـژن دەوێر ، (دەوار) .
٩) نووکا ڕمێ = سەرێ ڕمێ‌یە .
١٠) سنجاق = کولاب ، قولاب .
١١) کۆلەك وعود = ستون وعودە .
١٢) دولدر = ژمەهینا إمام علي (ع) ڕا دبێژن دولدر .
١٣) خێلنەك ژوان خێلنێ مەکعودە = سوارەك ژوان سـوارێ ئێلا مەکعودا عەرەبی‌یە ، کو ب مێرانی ناڤ دارن .

# کاروانی رۆشنبیری لەکوردستاندا

## لە هەولێر

دژوار : ئامادەی کردووە

### کاوێس ئاغای هونەرمەند

بووژانەوەی هونەری رابووردوو یادی شایەرو هونەرمەندانی کۆنینەمان ئەرکێکی پیرۆزی دەزگا رۆشنبیریی و هونەریەکانی کوردین ، بەم بۆنەیەوە لەم رۆژانەدا گۆڤارو رۆژنامەکانی کورد زمان پەیتا پەیتا چاومان روون دەکەنەوە ، لەم روانگەیەوە دەزگای رۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی لە رۆژی ۱۲/۹/۱۹۸۵ لە هۆڵی جەماوەردا کۆڕێکی بۆ مامۆستا جلال مەلا حسن خۆشناو لەژێر ناونیشانی (دەروازەیەك بۆ ناسینی کاویس ئاغای نەمر) سازکرد . لەسەرەتاوە مامۆستا محمود زامدار بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد .



مامۆستا جلال لەبەرکوڵی باسەکەیدا وتی [ لەبەرەبەیانی مێژووەوە تا ئیمڕۆ یەکێك لەو شێوازانەی کە کۆمەڵەی ئادەمیزاد کردوویەتی بە ئامرازی دەربڕینی بیروڕاو ئێش و ئازاری گۆرانی بوو ، بەڵکو ئەتوانین بڵێین کە گۆرانی کۆنترین شێوەبووە ئادەمیزاد بەکاری هێناوە بۆ ئەوەی هەست و نەستی خۆی و کۆمەڵەکەی لەو رێگایەدا دەربڕێ . ئەگەر سەیری فۆلکلۆری گەلان بکەین ئەبینین پڕە لەو جۆرە فۆلکلۆرییەی کە بە گۆرانی باسی باری رامیاری و کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵە دەکات لە قۆناخە جۆربەجۆرەکانی مێژوودا . گەلی کوردیش سەرەڕای کوێرەوەری و دواکەوتن و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی کە بە سەدەها ساڵ درێژەی کێشاوە گەنجینەیەکی بە نرخی هەیە لەو جۆرە گۆرانیانەدا ]

دوابەدوای ئەمە هاتە سەرباسەکەی و بە جیهانی ئەم هونەرمەندە کۆڵنەدەرەی گەڕاندین و بەم جۆرەی خوارەوە دابەشی کرد :

- بنەماڵەی کاوێس ئاغە
- کاوێسە لاڵ و هۆی لاڵبوونی .
- کاوێس ئاغەی نێچیروان
- کاوێس و چایخانەی علی فلیح
- کاوێس و تۆمارکردنی گۆرانیەکانی
- گەشتەکانی بۆ سلێمانی ، کوردستانی ئەودیوو تورکیا ، ناوچەی بیتوێن ، کۆیە.
- ئەوەی کاوێس ئاغەی هونەرمەند .

ئەوەی شایانی باسە ئەم هونەرمەندە (٣٨) لاوك و (٦) بەستەو (٣) حەیرانی بڵاوكراوو بڵاونەكراوەی لە پاش بەجێماوە . لە كۆتاییدا چەند برادەرێكی شارەزا گفتوگۆیان لە سەر باسەداكرد .

## هۆبەو هەواری خەج و سیامەند لە هەولێردا

نووسینەوەی كارەساتە دڵ تەزێن و سەرگوزشتەكانی بەر ئاگردانی شەوان زستانی كوردستان بە خامەی ئەدیب و ئەدەب دۆستان دەبێتە چەندان دیمەن و وێنەو دەیان حیواری سەرنج ڕاكێشەری سەر شانۆو سۆزی كەسەرو غەریباتی بینەرانی تامەزرۆ هەڵدەسێنێ ، بۆ نموونە .. تیپی شانۆی ڕۆشنبیری سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە ١/١٠/١٩٨٥و ڕۆژانی تردا شانۆگەری (خەج و سیامەند) لە نووسینی ناظم دڵبەندی شاعیرو دەسكاری و دەرهێنانی هونەرمەند تەلعەت سامان لە هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەردا پێشكەش كرد.

دەرهێنەری شانۆكە وتی [ ئەوەی بوونی مرۆڤایەتی دەپارێزێ ، نەزانست و ئازایەتی یەو نە هیچ شتێكی تر بەڵكو خۆشەویستیە .. نەمانی خۆشەویستیش لەهەر كۆمەڵگایەكدا زانست و ئازایەتی و گشت بەهرەكانی تری مرۆڤ دژ بە ناسكترین و پیرۆزترین هەستی مرۆڤایەتی دەخاتە كار .. چونكە گشت فەلسەفەكانی دونیا ناگەن بە خەندەیەكی سەر لێوی دڵدارێك .. جا خەج و سیامەندی ئێمە بانگەوازێكە لە پێناو خۆشەویستی .. لە دێرزەمانەوە ناڵەی دڵ و تائێستاش بەمراز نەگەیشتوە ] .

دوا بە دوای ئەمە كاكی نووسەر وتی [ خەج و سیامەند وەك دراما وەك عەشق و وەك لێكجودانەبونەوە یان لە خاكی سیپانی .. دەنگ و سەداو مێژووی ئەم میللەتەن . شەو نیە گوێمان ئاشنای زۆر لەم كارەساتە گەورانە نەبێتەوە .. كە لە مێژووی سەرفرازی خەج و سیامەندەكان بەدی دەكرێت ، مادام وایە با لە ئەمرۆوە ئەم كارەسات و سەربردانە لە سەر شانۆكان ئەوەی ئەمرۆ ڕاستەوخۆ ئەم مێژووەو ئەم عەشقەو



دڵدارانی ئەم خاكە ببین .. نەوەك ئەوانیش ببنە قوربانی ئەم عەشقە پاكە .. بەڵام هەتا دونیا دونیایە خەج و سیامەندو سیپان لەیەك نابن ]

ئەوەی شایانی باسە ژمارەی بەشداربوانی شانۆگەریەكە خۆی لە (٣٧) هونەرمەند دابوو لە نێوان كاری ئەكتەری و هونەری جیاجیا .. لە مانە محمد سعید ابراهیم - حیكایەتخوان ، علی احمد - كالۆی شوان ، ئالان علی احمد - سمكۆ لە منداڵی ، كەژاڵ یوسف حكیم - مەیرۆ بە منداڵی ، هەرمان سامان - سیامەند بە منداڵی ، بێخاڵ یوسف حكیم - خەج بە منداڵی ، صلاح عبدالله خۆشناو - سیامەند ،، دڵپاك طاهر كاوانی - خەج - ئاسایش عثمان دانش - زالۆی شوان ، ابراهیم حكیم - كوێخا ، دلشاد سامان - حەمۆ ، شلێر احمد - مەیرۆ ، جلال احمد - بەگ ، بكر معروف - سمكو ، ایوب صابر - برا (١) ، خلیل جمیل - باوكی سیامەند ، محمد احمد - برا (٢) ، قاسم نوری برا (٣) ، عبدالعزیز مجید - برا (٤) ، جمال اسماعیل - شوان ، عثمان حسین - شوان ، ئازاد سعید - شوان .

## پیشانگا

بە چاودێری بەڕێز ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری ی و لاوان .. نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی ناوچەی كوردستان پیشانگایەكی بۆ هونەرمەند (عدنان وهاب) لە ڕۆژانی ٨ - ١١/١٠/١٩٨٥ لە هۆڵی قوتابخانەی ئەیوبیەی كچاندا كردەوە . ئەوەی شایانی باسە ئەم پیشانگایە یەكەم پیشانگای ئەم هونەرمەندەیە ، پیشانگاكە بریتی بوو لە (٢٠) تابلۆی



هەمەجۆر زەیتی ، مەرەکەب ، جاف وەك دوو دڵدار ، زریان ، شیرین تەشی دەرێسێ ، ترس ، دایك ، گوڵەبەرۆژە ، ئافرەتێکی خەوتوو ، قیژاندن و چەندانی تر .

**عدنان وهاب جلال**

- لە ساڵی ١٩٥٩ لە شاری دووز خورماتو لەدایك بووە
- لە ساڵی ١٩٨٠ پەیمانگای تەکنەلۆژی بەغدای تەواو کردووە
- ئێستاش مامۆستایە لە ئامادەیی پیشە سازی (الانتصار) لە هەولێردا
- لە ساڵی ١٩٨٠ وە خەریکی وێنەگرتنە
- بەشداری زۆربەی پیشانگا قوتابخانەکانی کردووە .





○

## گۆڕێگی ڕەخنەیی

○

لە رۆژی ١٩٨٥/٨/٢٢ دەزگــای رۆشــنـبـیــریی و بڵاوکردنەوەی کوردی کۆڕێکی بە ناونیشانی گەرم بوونەوە یا نەبوونەوەی جلال بەرزنجی بۆ کاکی لاو فیصل دیهاتی لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەر سازکرد . لە سەرەتـاوە مامۆستا محمود زامدار بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد . کـاك فیصل لە سەربەندی باسەکەیدا وتی [ کەف و کوڵ هەڵچووی دەروونم ڕامــدەهــەژێنی و خــەمێکی هــێجــگــار گــەورەش رووبەرووی روخسارم بۆتەوە ، دام ئەرژێنێ و دام ئەچۆڕێنێ ،

وەختە ئاگرم تێبەربێ و پێستــەی دەستەکــانم هەڵئــەقرچێ ، سەری سەرخۆشیم وڕتر دەکا ، دەبێ چ شتێك هەبێت تەعبیر لەو خەمە گەورەیەی سەرسکۆڵەی دڵم بکـات ؟!.. یا بتـوانم خۆمی تیا بخوێنمەوە ، ئەو سەرشینەش سەری خۆی لە هەش

گرتووەو لە ئەستونگەی گیانم بەستراوەتەوە ، قولابی ڕاوی لە رۆحی گــەرووم گـیر کــردووە جــار جــارەش دەڵێ منــاڵەو بڕوبیانووی بێ سەمەرم بۆ دێنێتەوە ، نامن منــاڵم بیانــووی چەنگەچڕێ لە بەهەشتی لەش ئەگرم ]



دوا به دوای ئه‌مه هاته سه‌ر به‌شی یه‌که‌می ده‌روازه‌ی باسه‌که‌ی‌و گوتی [ ره‌خنه‌و ره‌خنه‌گرتن‌و ره‌خنه‌گری له سه‌رجه‌م مه‌جال‌و جۆره‌کانی ره‌خنه‌دا ، به بڕوا وتێگه‌یشتنی من هونه‌رمه‌ندیه‌کی هێجگار گه‌وره‌و به‌رزو به‌هاداروو به‌ر پرسیاری مێژوویی‌یه ، ده‌بێ بزانی چۆن مامه‌ڵه‌یه‌کی مه‌نتیقیانه‌ی ئه‌ده‌بی له گه‌ڵ کارێکی ئه‌ده‌بی داهێنه‌ردا هاوته‌باو هاوجووت ده‌که‌یت ؟!.. سه‌رباری ره‌چاوکردن‌و له‌به‌رچاوگرتنی کۆمه‌ڵێك ئیحساساتی خۆت‌و شاعیرو چیرۆك نووس‌و رۆمان نووس‌و .. نووس‌و نووس ]

له به‌شی دووه‌مدا وتی [ یه‌کێك له‌و پێناسه هه‌ره دیارو گه‌شه کردووانه‌ی گیانی خوێنه‌ری سه‌رده‌م که له زۆر کۆڕو ده‌مه‌ته‌قێی جۆراو جۆری دانیشتنی نێوان شاعیرو ئه‌دیب‌و شیعر دۆست‌و ئه‌ده‌ب دۆستان ئه‌وه‌یه ، که شیعر ئه‌و هونه‌ره به‌رزو سیحراوییه‌یه به هۆی رۆشنبیرییه‌کی به‌رفراوان‌و سه‌لیقه‌یه‌کی به‌پێز داده‌رێژرێ ، هه‌ستی جوانکاری‌و هه‌ڵچوون‌و روژاندنی سۆزمانی تیا ده‌جولێندرێ له چوارچێوه‌ی تایبه‌تیه‌کانی ده‌ربڕین ، ئه‌ویش مه‌به‌ست له ته‌کنیك ، بیرکردنه‌وه شێواز ، زمان ، بینای درامی‌و هتد .. سه‌رباری بیروڕای هه‌ریه‌که به گوێره‌ی دونیاو موعانات‌و ئه‌رزیه‌ی فیکری‌و چه‌سپاندنی ، که جمکه‌کانی یه‌ك یزدانی دراوی ئه‌م دونیایه وێك ئه‌چن که‌واته من‌و تۆ بۆ له یه‌کتر بچین ؟! ]

دوا به دوای ئه‌مه هاته سه‌ر به‌شی به‌ره‌و گه‌رم بوونه‌وه‌ی نێو گه‌رم نه‌بوونه‌وه‌ی به‌رزنجی‌و چه‌ندان نموونه‌ی شیعری دیوانه‌که‌ی خسته روو به‌م جۆره تا گه‌یشته دوابه‌ندی باسه‌که‌ی‌و گوتی [ کاك جه‌لال له کۆکردنه‌وه‌ی دژایه‌تی‌و ناکۆکیه‌کانی ئه‌بعادی فه‌لسه‌فی ، له نێو هه‌ر هه‌مواندا بوعدێکی فه‌لسه‌فی تایبه‌ت به جیهانی خۆی دروستکردووه ، بۆیه گه‌ڵێ دژواره شیعری ره‌سه‌ن‌و نه‌مر بخه‌ینه ژێر ناوێك‌و قوتابخانه‌یه‌ك‌و رێبازێکی ئه‌ده‌بی یاریچکه‌یه‌ك ، ئه‌وه‌یه ده‌نگی جه‌لال به‌رزو نه‌مر ده‌کات شیعره‌کان بۆ خستنه ژێر روشنایی قوتابخانه‌یه‌کی ئه‌ده‌بی له جیوه ده‌چن ده‌ستی بۆ ده‌به‌ی له ده‌ستت ده‌رباز ده‌بێ‌و خۆشترین‌و به له‌زه‌تترین مه‌زاقی شیعریت پێ ده‌کات ]

له کۆتاییدا چه‌ند براده‌ری شاعیرو شیعر دۆست بیروڕای خۆیان به‌رامبه‌ر به باسه‌که ده‌ربڕی .

## پیشانگا

کۆمه‌ڵه‌ی هونه‌ره جوانه‌کانی کورد لقی هه‌ولێر له رۆژانی ١٦ ـ ٢٠ / ١٠/ ١٩٨٥ پیشانگایه‌کی جوان‌و خنجیلانه‌ی بۆ هونه‌رمه‌ند کمال سعدی مصطفی له هۆڵی قوتابخانه‌ی ئه‌یوبیه‌ی کچان کردوه ، ئه‌وه‌ی شایانی باسه ئه‌م پیشانگایه دووه‌مین پیشانگای ته‌شکیلی هونه‌رمه‌ند کمال سعدی‌یه . پیشانگایه‌که بریتی‌بوو له (٣٤) تابلۆی هه‌مه‌جۆر وه‌ك چیاو ئه‌سپ ، دیمه‌ن ، له که‌له‌پووری کورده‌واری ، په‌نجه‌ره‌یه‌ك له قه‌لا ، خوێندن ، گه‌زه‌نگ ، پیره‌ژن ، رێگای شۆرشگێری‌و چه‌ندانی‌تر .

**کمال سعدی**

- له ساڵی ١٩٥٦ له هه‌ولێر له دایك‌بووه
- ده‌رچووی پۆلی شه‌شی وێژه‌یه
- ئه‌ندامی نه‌قابه‌ی هونه‌رمه‌ندان‌و کۆمه‌ڵه‌ی هونه‌ره جوانه‌کان‌و کۆمه‌ڵه‌ی وێنه‌گرانی عیراقه .
- له زۆر پیشانگا به‌شداری کردووه وه‌ك
ـ معرض الصداقة برلين ١٩٧٤

- معرض السلام العالمی ١٩٧٥ بغداد
- معرض الثقافة الكردية ١٩٨٣ وچەندانیتر

● دوور کتێبی چاپکراوی هەیە
- شەش چیرۆکی کورت لە گەڵ چیرۆکنووس صابر رشید ساڵی ١٩٧٦
- وون بوون ساڵی ١٩٨٤ .

●

# لـــــە دهـــــۆکـــــێ

ژ ئامادەکرنا : مەتین

## پیشانگەهەکا کتێبا

ب هـەلکەڤتنـا دەستپێکرنـا دەستدرێژیت تـوخم پـەرێسێت فـارسی ، ل سەر وەلاتێ مـەیێ تێکوشـەر ، هێا پـارێزگـارێ دهـوکێ ، ل رۆژا ئێـکشـەمبێ ، رێکـەڤتی 22 — 9 — 1985 پێشانگەهەکا مەزن یا پەرتوکا ڤەکر ، ل هولا ئامادەییا کاوە .





هەڤال ئەمینداری نهێنیو ئەندامێت سەرکردایەتیا لقێ حزبا بـەعسا عـەرەبیا هـەڤپشکی ل دهوکێ ، ل ڤێ پێشـانگەهێ ئامادەبون . هژمارەکا بەرفرەهـ یا پەرتوکێت دامو دەزگەهەیت بـەلاڤکرنێ ، ییت عـەرەبیو بیانی ، هـاتنە پێشچـاڤیکرن . ژهرمارا ڤان پەرتوکا ، نێـزیکی سەد نـاڤنیشانێت پـەرتوکێت نوی ، بو جارا ئێکێ هاتنە پێشچاڤیکرن ل بازێـرێ دهوکێ ، دپێـکهاتی بـون ، ژ تەڤ لاییت زانـینو زانیـاریـا . هـەژی گوتنێیە ، کو بهایێ پەرتوکا عیراقی چـل ژ سەدێ ژ بکـرڕا ئانیبو خار ، پەرتوکا بیانی ، بیست ژسەدێ ، یا عەرەبی سیە ژ سەدێ .

## « مزویری ـ حەیرانوکو مەلەڤانی ب پەیڤا »

نـاڤنیشانێ کـورەکی بو ، هـاتـە پێشکێش کـرن ، ل رێکـەفتی 26 — 9 — 1985 ، ژ لایێ هۆزانڤـانێ هێرا محسن قـوچانیڤـە ، ژ چالاکیو بـزاڤێت بەردەوام ، ییت ئێکـەتیـا تورەڤانو نڤیسڤانێت کورد ـ تایێ دهوکێ .

تورەڤانێ برا صەدیق هرووری ، بکارێ رێڤـەبەریـا ڤی کوڕی رابو ، یێ کو هژمارەکا باش یا تورەڤان وئەدەب دوستا لێ ئامادەبوین .

ژ ریفە کەکێ محسن یێ خو هاڤێتە دەرازینکا گـوتارێ خو ، بئاخفتنەکا کورت ، دەربارەی هوزانا کلاسیکیو هوزانا سەربەست . پاشی بناڤ باسێ خودا چو خارێو بدریژی کـرە بەحسێ مزویریو هوزانا هەڤچەرخ . پشتی هینگێ بشێوەکێ جوانو بسەرکەفتی ، ئەڤا خالێت ژێری د حەیرانوکا هوزانڤانێ بەهرەوەر ، عبدالرحمن مزویری دا ، خویاکرن :

- **موسیقا**
- **ناڤەروك**
- **وینێت شعری**

ئەڤ لایەنە ب بەرفرەهی ، ژ مەرا رونکرن بو مـوکوم کرنا راو بوچونێت خو ـ کاك محسنی ـ مشە نمونە ژ شعرێت مزویری ئانینو بدەنگێ خو یێ خوش بو مە خاندن .

دڤی چارچوڤەیدا هێژایێ موحازر ؛ بیرو رایێت خول سەر حەیرانوکا مزویری پێشچاڤکرن .

نهو ژی ژبەرکو دا وینە زلتر لێ بهێت ، مە پێخوشە ئەم نفشکێ بیرو رایێت وان برادەرێت کەتینە دانو ستـاندێ ، ل هێزە دیاربکەین .

**ـ صدیق شرو :**

حەیرانوکا مزویری یا سەربریە ، چ کریارو کەسوکاتی تێدا نینە ، خوزی ئەڤ حەیرانوکە بڤی کاری ئاڤا نەکربان .

ـ حوارا وی د ناڤبەرا دووا دایە ، هـەر دوو دمەظلومن ، چ چارە سەرکر بڤێ حوارێ ؟

ـ حەیرانوك ، یا وەختەکێ رومانسیبو ، چ مفای نا گەهینیتە شعرا هەڤچەرخ .

ـ جەو دەم ، د حەیرانوکا مزویریدا نەهاتینە .

**ـ محسن قوچان :**

سەیدای (بەحسێ کاك صدیقی) چ جیاوازی نە ئێخستە ناڤبەرا لاووکاو حەیرانوکا ، ئەڤ تشتێت وی گوتین ، جهو دەم د حەیرانوکا دا نینن .

ـ کامیران بەرواری : کاك محسنی گوت :

مـزویـری یێ رومـانسیـەو بـەس ، مـزویـری شـاعـرەکێ « ملتەزمە » .

ـ محسن قـوچان : مـاکێ گوتیـە نەیێ مـولتەزمـە ، یـان چ



چارەسەری نەکرینە .

ـ **نجیب بالایی** :مە دڤێت بزانین مزویری چ ل حـەیرانـوکێ زێدەکریە .

ـ محسن قوچان : مزویری پێکول کریە ل هێرە، یارێ بکەتـە وەلات ، هەستێت دەرونیو رموزێت نوی ، هەمی زێدەبینە ل شعرێ کرین . ئو ئەڤ کارێ وی کلوپیتکا بەهرەوەرییێ یە .

ـ رمضان عیسی : مزویری فولکورێ وەرگرتیو د ئاڤاهیێ شعرا خودا ، یێ بکار ئینای .

حجی جعفر : وینەکێ د شعرێدا هاتی کو (د خەونێدا دبیتە زاڤا) د ئەفسونێت کوردیدا ڤێ چەندێ ب شووم دزانن ، لەوما ئەڤ وینە ئارمانجا خو بجهـ نائینیت .

ـ محسن : من نەگوتیە ئەڤە خەونـە ، من یا گـوتی ، خەون روژکا هشیارییێ یە .

عبدالکریم : یا ژ منڤە تو درێکخستنا بابەتێ خوەدا ، نەهندێ سەرکەتیبوی ، ژبەرکو تە وینە د ناڤئێك هلکرن ، باشتربوژی تە کەلەپوور ب بابەتەکێ جودا دانابا ، نە هەما چ پەیڤا بهێت ، دێ بیتە کەلەپور .

ل دوماهیێ برایێ موحازر بەرسڤا پرسیارێت برادەرا داو بەرەڤانی ژ بیروراو بوچونێت خو کـر ، بشێوەکێ جـوانو ب

